# تورکیا و ململانێی

## عیلمانیەت - ئیسلام - کورد

نووسینی: رضا هلال

وەرگێڕانی: دلێر عباس

لێکۆڵینەوە - وەرگێڕان

# تورکیا و ململانێی عیلمانیەت - ئیسلام - کورد


نووسینی

رضا هلال

وەرگێڕانی

دلێر عباس



سلێمانی - ١٩٩٩

## نووسەر لەچەند دێڕێکدا

***************

-رضا هیلال.

-زانستی سیاسیو ئابووری لەزانکۆی قاهیرەو نیویورك تەواوکردووە.

-نووسەرو ڕۆژنامەنووس لە ڕۆژنامەی (الاهرام).

-بەڕێوبەری نووسینگەی گۆڤاری (العالم الیوم) بووە لە نیویورك.

-پەیامنێری نەتەوە یەکگرتووەکان بووە لە بۆرصەو وول ستریت.

-خاوەنی چەندین بەرهەمی کۆمەلآیەتیو سیاسییە.

*نووسەر لەئەنجامی گەشتێکی مەیدانی بۆ تورکیا ئەم کتێبەی نووسیوە بەناوی (السیف والهلال)- دار الشروق.

***********

**ناوی کتێب:-** تورکیاو ململانێی عیلمانیەت - ئیسلام - کورد

**بابەت:-** لێکۆڵینەوە.

**نووسەر:-** رضا هیلال

**وەرگێڕانی:-** دلێر عباس

**ساڵ:-** هاوینی ١٩٩٩

**کۆمپیوتەر:-** کۆمپیوتەری ژیر

**چاپی یەکەم-** ئۆفسێتی ژین

# پێشەكی:-

بۆ ئێمەی كورد ئاگاداربوون و زانیار بوون بە واقیعی ژیانی سیاسیو پێكهاتی (ئابووریو كولتووریو كۆمەڵایەتیو تا...)ی گەلان و دەوڵەتانی هاوسنوورمان گەلەك پێویست و سوودمەندە، بەتایبەتیش سەبارەت بەو گەلانەی كە دەوڵەتەكانیان، ڕاستەوخۆ لە پرۆسێسی داگیركردن و چەوساندنەوەی نیشتمان و گەلەكەماندا بەشدارن، ئەوە وەڵامدانەوەیەكی بابەتیو مەعریفیانەی پرسیاری ناسینی خودو دەوروبەرە، لێرەدا خودێكی بنەدەستكراو داماڵراوە لەهەموو ماف و واتا ڕاستەقینەكانی ژیان - وەك گەلێك كە خاوەنی خاكی ستراتیژی فراوان و تواناو كەرەستە دینامیكیو ئابووریو بەرهەمدارییەكانە.
دەوروبەرەكەش بەرانبەرێكی خاوەن دەسەڵاتی سیاسی كاریگەرو گەورەی وەك دەوڵەت و پێكهاتە ستراتیژیەكانی وەك سوپای مۆدێرن سازندەی تەكنیك و تەكنۆلۆژیای سەربازین و، دەزگای ڕاگەیاندن و كولتووری بەتواناو كاریگەرو، پەیوەندی دیبلۆماسیو سیاسی جیهانیو هەرێمیی ڕەسمیو ستراتیژییان هەیەو خاوەنی چەندین دەزگاو دامەزراوەی جۆراوجۆری كارتێكەری سایكۆلۆژیو پەروەردەییو ڕەوشتیو كولتووری تێكدەراندن...
لەسەر ئەو ڕاستیانەی سەرەوە، ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوەی برای بەڕێز (دلێر عباس) بەشێكە لەو پرۆسەی ناسینكارییەی یەك لەناوەندو جەمسەرە هەرەگرنگ و كاریگەرەكانی دەوروبەرە بۆ سەر خودی كوردی، ئەویش دەوڵەتی توركیایە ئەم بەرهەمە كە وەرگێردراوی كتێبی (السیف والهلال)ی ڕۆژنامە نووسی میسری (رضا هلال)ە یەكێكە لەو لێكۆڵینەوە بابەتیو ئەكادیمیانەی واقیعی ژیانی سیاسی كۆمەڵی توركی هەر دەگەل دروستبوونی دەوڵەتی گورگە بۆرەكان لەساڵی (١٩٩٢)وە هەتا (١٩٩٨) ئەو ساڵەی كە نووسەری ناوبراو گەشتی مەیدانی خۆی بە وڵاتی توركیادا كردووەو ئەنجامی دیدارو كۆبوونەوەو

تێڕوانینەکانی خۆی لەسەر جم و جۆڵ و ڕەوتە سیاسیەکانی تورکیا، تیایدا تۆمارکردووەو لێتۆژینەوەکەی خۆی لەدووتۆیی کتێبێکدا، بەئەنجام گەیاندووە.
نووسەری بابەتەکە، لەو گەشتە فیکریی تۆژینەوەیدا بەناو گۆڕەپانی سیاسی تورکیادا، زیاتر لەدەوری دوو دیاردەی سەرەکی ئەو واقیعە سیاسیە، خولی خواردووەو چەقبەندی کردووە، کەئەوانیش:—
١—ڕۆڵی سوپا، واتە دامەزراوەی سەربازی، لەژیانی سیاسی ئەو دەوڵەتەدا.
٢—چۆنیەتی کارو هەڵسوڕانی ڕەوت و هێزە ئیسلامیەکان لەتورکیاداو شێوازی وەستاندنەوەو بەرەنگاری دامەزراوەی سوپاو ژەنەراڵەکان لەبەرانبەریان تەوەرەیەکی تریش کە نووسەر لەو دووتەوەرەیەی سەرەوە کەمتر بایەخی پێداوە - واقیعی پارتە عیلمانیەکانی ئەو وڵاتەیە، کە نووسەر زیاتر قامك لەسەر لایەن و ئاڕاستە دزیۆو گەندەڵیەکانیان، دادەنێت و لەو بارەوە بە ووردیو بابەتیانە، سەرنج و لێکدانەوەکانی خۆی لەو بارەوە ڕوونووس کردووە، لەوەشدانموونەی دووپارتی دیارو سەرەکی عیلمانی هەڵبژاردووە واتە (نیشتمانی دایك) و (ڕێگای ڕاست).
تەوەرەیەکی گرنگ تری ئەو دانراوەی (رضا هلال)ی ڕۆژنامە نووس کەلەباری بایەخپێدانەوە بەدوای ئەو تەوارانەی سەرەوەدا دێت لەم بەرهەمەدا باری سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابووری کوردەکان لەباکووری کوردستاندا - واتە ئەو ناوچە وویلایەتە کوردیانەی کە لێکندراون بەدەوڵەتی تورکیاوە. دیارە نووسەر لەبەشێکی ئەو گەشتە مەیدانیەیدا سەردانی چەند شارو ناوچەی کوردی لوێندەری کردووە، بەتایبەت شارەکانی (وان)و (دیاربەکر) نووسەر واقیعیانە گرنگترین و دیاترین سیاسەت و نەخشەیەکی تورکان و دەوڵەتەکەیان لەبەرانبەر ئەم ناوچانەدا، بەدی دەکات و ئاماژەکاری دەکات. ئەمیش سیاسەتی بەسەربازی کردنی (عسکرة) ئەو ناوچە کوردیانەیە، لەمیانی هێنانی ژمارەیەکی زۆری سەربازو هێزی چەکداری سوپاییو ناسوپاییو هێزەکانی جەندرمەو پۆلیس و ئاسایش ... بۆ ئەم ناوچانەو دامەزراندنی سەدان و هەزاران بنکەو مۆڵگەی

سەبازیو ئاسایش تیایاندا. کە ئەوانەش هەمووی بەشوێنی خۆیان بوونەتە هـۆی دواخستنی ترسناك و قووڵی ئابووری - کۆمەڵایەتیو کولتووریـیو ژیاریی ناوچـە کوردیـەکان لەلایـەك و لەلایـەکی تریشـەوە، زیـاتر زەمینـەی ســەرهەڵدان و بەرفراوانبوونی شەڕی دوژمنکاریو داگیرکارییان بەسەر گەلی کوردی ئەو بەشـەی کوردستاندا، خۆشکردووەو تۆکمە کردووە.

جێگای باس و ئاماژە پێکردنە کەبرای وەرگێر تەنـها ئـەو بەشـەی لـەو بەرهەمـە وەرگێڕاوە کە پەیوەندی بەم دووهەمی دواییەوە هەیە، واتـە لەسـاڵی (١٩٨٠)وە تا ساڵی ١٩٩٨ دیارە ئەوەش بـەهۆی وابەسـتە بوونـی ڕووداو ئەوزاعـەکانی ئـەو ماوەیە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆو دینامیکیانە بەساتەوەختی ئێستاوە هـەروەها بەباوەڕی وەرگێر ئەو ماوەیە خوێنەری کورد زیـاتر بـەلای خۆیـدا ڕادەکێشـێت و پابـەندی بابەتەکـە دەکـات و لـــە گێرمـــەو مـــاندووبوونی خزانـــە نـــاو گێڕانەوەمێژوویەکان دوور دەخاتەوە، بەتایبەتیش کە زۆرێك لـەو ڕووداوانـە زۆر باسیان لێوەکراوەو کاتیشیان بەسەر چووە و بـێ ئـەوەی کاریگـەرێکیان لەسـەر ڕەوتی ئێستا بەجێ هێشتبێت.

بەهیوای سەرکەوتن و بەردەوامبوونی زیاتر برای هێژا (کـاك دلێر) لـەو میانـەداو بەرهەمهێنان لەبواری نووسین و بیرکردنەوەدا.

محمد صابر کریم

١٩٩٩/٦/٢٧

# رۆڵی سوپا لە رووداوەکانی ساڵی ١٩٨٠

کۆتـایی حـەفتاکان، لـە تورکیـا زێدەڕۆیـی سیاسـی بـووە گرفتێکـی راستەقینە، هەر یەك لە رێکخراوەکانی وەك (رێکخراوی چەپی لاوان و ئیسلامی‌یە ئوسوڵی‌یەکان و رێکخـراوی گورگـەبۆرەکان - منظمـة الذئـاب الرمادیـة) تووشـی رووبەڕووبوونەوەیەکی بەر چاوهاتن، ئەمەش بووە هۆی کۆنترۆڵ کردنی شەقام و شوێنە گشتی‌یەکان و حەرەمی زانکۆکـان و چـەند شـوێنی تریـش لـە لایـەن ئـەم دەستەو گروپانەوە زیاتر لەو قوتابی و لاوانە پێك هاتبوون کە هیوابڕاو بـوون لـە قبوڵکردنیـان لـە زانکۆکـانداو بـە هـۆی ئـەو قەیرانـە ئابووری‌یـەی وولات تـێی کەوتبوو بێ بەش بوون لە چنـگ کـەوتنی کـارو پیشـەیەکی گونجـاو. لـە مـاوەی ساڵەکانی ١٩٧٤-١٩٧٧ حکومەتـە راسـت رەوەکـانی تورکیـا پشـتگیریان لـە هـەردوو حـیزبی (جولانـەوەی نیشـتمانی فاشـی - الحرکـة الوطنیـة الفاشـیة) و (رێکخراوی گورگە بۆرەکان) دەکـرد لـە دژی هـێزە چەپـەکان، بـەڵام لـە مـاوەی فەرمانڕەوایەتی (ئەجەویدا ١٩٧٨ -١٩٧٩) چەپەکان پشتگیریان لێکراو ئەجەوید پاراستنی ئـەم هـێزە چەپانـەی گرتبـووە ئەسـتۆی خـۆی هەرچـەندە رەخنـەی زۆریشی لێدەگیراو بە پێشەوای چەپ ناویان دەبرد.

کاری توندوتیژی رۆژانە لە زیادبووندابوو. ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی قوربانی‌یەکان لـە (٢٣٠) کەسـەوە گەیشـتە (١٢٠٠) کـەس وە سـاڵی (١٩٧٨-١٩٧٩) ئـەم ژمـاەیـە زۆرزیـادی‌کردو گەیشـتە (١٥٠٠) کـەس.حاڵەتەکـە گەیشـتە ئـەو رادەیـەی کـە دیاردەی (زێدەڕۆیی سیاسی - التطرف السیاسي) ببێتە بەشێك لـە کـاری توندو تیـژی ئـەم حاڵەتـەش دەگەڕایـەوە بـۆ ئـەو بـارە رۆشـنبیری‌یە - کلاسـیکی‌یەی پـەیڕەویان دەکـردو گیـانی تۆڵـەیان زیـاتر تیـا دەورووژا، باشـترین نمونـەش قەسابخانەکەی (کهرمانماراس) بوو کە تووررکەکان پێی هەستان لـە دژی تورکـە

شیعەکان - عەلەوی‌یەکان و بێجگە لەو کوشتارانەی لە نێوان کوردو تورك بەرپا دەبوو.

رووداوە سیاسی و کومەلایەتی یەکانی کۆتایی حەفتاکانی توركیا رەنگدانەوەی ئەو قەیرانە گشتی‌یانە بوون کە توركیا تێیکەوتبوو.

لە سالی ١٩٧١ تا ١٩٧٩ توركیا دوانزە حکومەتی کەمینەو وئیئتیلافی بە خۆیەوە بینی واتا هەر بە نۆ مانگ جارێك حکومەتێك دەگۆرا.

تێکرای گەشەی ئابووری بەرەو شێواندن دەرۆیی سالی ١٩٧٩ گەشەی ئابووری (٨٪) هاتە خوارێ بۆ (١,٧٪)، وە بێکاری روو لە زیادبوون بوو بە رێژەی ٢٠٪ وە رێژەی هەلاوسان زیادی کرد بۆ ٨٥٪ .

# کودەتای ١٢ ئەیلولی سالی ١٩٨٠

کات ژمێر (٦)ی بەیانی بوو بە کاتی ناوخۆ ئێزگەی رادیۆی توركیا بەیانێکی سەربازی بلاوکردەوە، هۆکانی بەرپابوونی کودەتاکەی تیا روون کردبۆوە کە بەم شێوەیە بوو..

(دەولەت و دام و دەزگاکانی لە بەرێوەبردنی کاروبارەکاندا تووشی بن بەست هاتبوون، هەیکەلی دەستوری وولات پرِی بوو لە کێشمە کێش و نابەرابەری، پەك کەوتە بوون لە ئاست کێشەکانی وولاتداو هیچ چارەسەرێکی ئەوتۆیان پێ نەمابوو، حیزبە سیاسی‌سەکانیش یەککرتوو نەبوون و لێکترازاوو پچرِ پچرِ بوون، چالاکی هێزە جودایی خوازەکانیش - الانفصالیون لە زیاد بوون دابوو ژیان و مولك و مالی دانیشتوانیش نەدەپارێزرا، هێرش بردنە سەر قوتابخانەو زانکۆو رێکخراوەکان و شوێنە قەزایی‌یەکان بەردەوام بوو، وولاتیش خەریك بوو دەبوو بە مەلبەندێك بۆ جیابوونەوەو بەرپابوونی جەنگی ناوخۆ دەولەتیش بێ توانا بوو لە ئاست چارەسەر کردنی ئەم کێشانەدا). ئەم بەیانە کە بەیانی یەکەم بوو بە ناوی ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆرشەوە راگەیەندرا دوا بە دوای ئەمە هێزە

چەکدارەکان دەستیان گرت بە سەر تەواوی پەرلەمان و دەسەڵاتە سیاسی‌یەکان و کۆنترۆڵی هەموو چالاکیە سیاسیەکانی حیزبەکانیان کرد، هەروەها پەلاماری یەکێتی سەندیکای کرێکارانی چەپیان دا (DISK)، پەلاماری یەکێتی سەندیکای کرێکارانی راست ڕەویان دا (MISK)، هێرشی چەکداری‌یان کردە سەر سەرۆکی حیزبەکان و زۆریان دەستگیر کردن جگە لە (ألبار صلان توركيش) کە سەرۆکی حیزبی جوڵانەوەی نەتەوەیی بوو بۆ ماوەی دوو ڕۆژ خۆی شاردەوەو پاشان خۆی دا بە دەستەوە حوکمی عورفی سەراپای وڵاتی گرتەوەو سەفەر کردن بۆ دەرەوەی وڵات قەدەغە کرا، مەبەستی جەنەراڵە کودەتاچیەکانی ساڵی ١٩٨٠ تەنها گۆڕینی سیستەمە سیاسی‌یەکە بوو، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارانە دەسەڵاتداران پشتیان بەست بوو بە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی - مجلس الامن القومي - جەنەراڵ (كنعان ايڤرين) هەم سەرۆکی ئەم بەشەو هەم سەرۆکایەتی وڵاتیشی دەکرد، لە لایەکی کەوە جەنەراڵی خانەنشین (بۆڵنت ئەلەسو) بەسەرۆکی ئەنجومەنی حکومی - (مجلس حكومي) دانرابوو کەپێك هاتبوون لە (٢٧) ئەندام، یارمەتی جەنەراڵ (كنعان ايڤرين) یان دەدا پێشنیارو ئامۆژگارییان پێشکەش دەکرد وە بڕیارەکانیشیان بۆ جێبەجێ دەکرد، دەسەڵاتێکی تەواو بەخشرایە خەڵکە سەربازی‌یەکان لە گشت ناوچە جیاجیاکانی وڵات دا هەموو مافێکی تەواویان هەبوو لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا. جگە لە مانەش کارەکانی وەك ڕۆژنامەگەرێتی و سەرپەرشتی کردنی یەکێتی‌یە کرێکاری‌یەکان درایە دەست ئەمان و بۆشیان هەبوو ڕۆژنامەکان داخەن وە یەکێك لەو ڕۆژنامانەی دایانخست ڕۆژنامەی (جمهوريەت) بوو لە ساڵی ١٩٢٤ ئەتاتورك دایمەزراندبوو، وە لە ساڵی ١٩٨٢دا هەر ئەمان چالاکی حیزبە سیاسی‌یەکانیان هەڵوەشاندەوەو دەستیش گیرا بە سەر کەل و پەل و بارەگاکانیان .

سەراپای وڵات شەپۆلێکی گرتن و ڕاوەدوونانی بە خۆوە بینی سەرانی کودەتاچی‌یەکان لیستی تایبەتیان پێبوو بۆ گرتنی ئەو کەسانەی بە دڵیان نەبوو

هەر لە شەشەمین هەفتەی دوای کودەتاکە ۱۱۵۰۰ کەسیان گرت ژمارەی ئەم گیراوانە زیادی کرد بۆ ۳۰ هەزار کەس لە کۆتایی ساڵی ۱۹۸۱ ژمارەی گیراو گەیشتە (۱۲۰٦۰۰) کەس ، ئەم شەپۆلە بەرفراوانە چین و توێژە کۆمەڵایەتی یە بەرزەکانیشی گرتەوە وەك ئەندامانی یەکێتی یە پیشەیی و حیزبی یەکان، مامۆسایانی زانکۆو رۆژنامەنووسان و پیاوانی یاساو ئەو کەسانەی مەیلیان هەبوو بە لای چەپ و ئیسلامی یەکاندا، هەر لەو ماوەیەدا (۳۰۰) مامۆستای زانکۆ لە سەر کار دەرکران موچەکانیان برین وەماوەی کارکردنیان لەهەر شوێنێکی تری حکومیدا لێقەدەغەکرا.

زیندانە سیاسی یەکان پڕ بووبوون لە ئەندامانی تێکڕای حیزبەکان رەفتاری لێدان و ئەشکەنجە پیادەکرا، دادگای سەربازی حوکمی لە سێدارەدانی بۆ (۳٦۰۰) کەس دەرکرد.

سەرکردەکانی کودەتای ساڵی ۱۹۸۰ چوار وانەی گرنگیان لە هەردوو کودەتاکەی ۱۹٦۰، ۱۹۷۱ وەرگرت کە ئەمانە بوون:-

١- دەسەڵات دەبێت لە دەست سوپادا بێت، هەردوو سەرۆك ئەرکان و سەرۆکی گشتی هێزەچەکدارەکان بەشێك بن لەم دەسەڵاتە تا کێشە لە سەر دەسەڵات دروست نەبێ نمونەش بۆ ئەمە کودەتاکەی ساڵی ۱۹٦۰ بوو.

٢- سەرۆکی کودەتا بە هەر شێوەیەك بێت دەسەڵاتی سیاسی بگرێتە دەست، بوار نەدا کە سیاسی یەکان دەسەڵات بگرنە دەست یا هاوبەشی بکەن.

٣- پێش بە ئەنجام گەیاندنی کودەتا پیلانێکی روون و ئاشکرا هەبێت و کاری لە سەر بکرێت.

٤- پێش بە ئەنجام گەیاندنی کودەتا کار بکرێت بۆ لێك ترازان و هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی سیاسی و مەدەنی پێشوو تا ڕێ خۆشکەر بێت لە بەردەم سوپادا بتوانێ سەر لە نوێ کۆنترۆڵی سیستەمی سیاسی بکاتەوە.

## دەستوری نوێ:

دوای کودەتاو بۆ دانانی دەستورێکی نوێ لە رۆژی ٢٣ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨١ کۆبوونەوەیەك گیرا کۆمەڵەیەکی تەشریعی پێك هات لە ١٦٠ ئەندام کە(١٢٠ )کەسیان فەرمانڕەوا سەربازی‌یەکان دەستنیشانیان کردبوو وە(٤٠) ئەندامەکەی تریش ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی دەستنیشانی کردن وە لە ئاکامدا (١٥) ئەندام هەڵبژێردرا بۆ لیژنەی تەشریعی بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر (ئۆرهان دەکاتشی). ئەم هەڵبژرادنەش بە هەمان وێنەی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٦٠ بوو گەڕانەوە بوو بۆ هەمان دەستوور.

دەسەڵاتی تەنفیذی بڕیاری‌دا بە زیاد کردنی دەسەڵاتی سەرۆك کۆمار و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ ئەوەی بتوانرێ ئازادی‌یەکان کەم بکرێنەوە مانگرتنە سیاسی‌یەکان قەدەغە بکرێن تاکو بەرژەوەندی گشتی و ئاسایشی گشتی و قەوارەی دەوڵەت نەشێوێت.

پاش چەسپاندنی دەستووری نوێ جەنەڕاڵ ایڤرین پۆستی سەرۆکایەتی وولاتی گرتە دەست بۆ جارێکی تر کەسایەتی‌یە سەربازی‌یەکان ویستیان هەیکەلی سیستەمی سیاسی دابمەزرێننەوە چەند بڕیارێکیان بۆ جەماوەر ڕاگەیاند هەتاکو (١٠) ساڵی تر هیچ سیاسی‌یەکی پێش کودەتا بۆی نی‌یە کاری سیاسی ئەنجام بدات بەڵام ئەتوانن حیزبێکی تازە پێك بهێنن بە مەرجێك ئەنجومەنی ئاسایی نەتەوەیی سەرپەرشتی بکات لە گەڵ ئەمەشدا نابێت قوتابی و مامۆستاو فەرمانبەرانی دەوڵەت بەشداربن تێیدا.

وە لە کاتێکدا هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٣ دەستی پێکرد تەنها سێ حیزب ڕێگەی پێدراو بەشداریان تیاکرد:-

١- حیزبی دیموکراتی نیشتمانی:- لە سەر دەستی جەنەڕاڵ و کەسایەتی‌یە سەربازی‌یەکان پێك هاتبوون.

٢- حیزبی گەل:- سەرۆکەکەی (نجدەت غالب) بوو نوێنەرایەتی باڵی ئەتاتورکیی دەکرد.

٣- حیزبی نیشتمانی دایك : سەرۆکەکەی (تورگۆت ئۆزال) بوو هەوڵی ئەدا بۆ چاکردنی لایەنە ئابوریەکان وە ساڵی (١٩٧٩ - ١٩٨٠) لە ماوەی حوکمی عەسکەرتاریتی دا بووە وەزیری دارایی و وئابووری.

ئەنجامی هەڵبژاردنەکە بەم جۆرە بوو:

حیزبی ئۆزاڵ (نیشتمانی دایك) ٤٥٪

حیزبی جەنەراڵات (دیموکراتی نیشتمانی) ٣٠٪

ئۆزال کرایە سەرۆکی جکومەت وە لە ناو حیزبەکەیدا (٩) ئەندازیاری تیابوو بۆیە جەماوەر بە (حکومەتی ئەندازیاران) ناویان دەبرد.

ئۆزال سور بوو لە سەر دڵ راگرتنی هەر یەك لە سەرمایەداری پیشەسازی کە حیزبی عەدالەت نوێنەرایەتی دەکرد، وە خاوەنی پرۆژە بچووکەکان کە حیزبی سەلامەی ئیسلامی نوێنەری بوو، خوشی نزیك کردەوە لە حیزبی (جولانەوەی نیشتمانی)، سەرباری ئەمە ئۆزال خۆی وا بەستە بوو بە ڕێبازی نەقشبەندی‌یەوە.

مەبەستی بوو کە قۆناغ بە قۆناغ دیموکراتی بگێڕێتەوە ناو تورکیاو کەسە مەدەنی‌یەکان سەر لە نوێ بهێنێتەوە ناو گۆڕەپانی سیاسی.

لە هەڵبژاردنی شارەوانی‌یەکانی ساڵی ١٩٨٤دا سوودێکی زۆری لە دەنگەکانی ناو پەرلەمان بینی بە هۆی هەڵگرتنی ئەو یاسایەی کە لە دژی حیزبە کۆنەکان بوو، بانگەشە کردنەوەیان سەر لە نوێ بۆ کۆڕی سیاسی، لەم ئاڵوگۆڕەدا حیزبە دیموکراتی‌یە نیشتمانیەکان کە کەسایەتی‌یە سەربازی‌یەکان دەیان برد بە ڕێوە تەنها (٧٪) ی دەنگەکانیان بە دەست هێناو ئەمە وای کرد زۆربەی ئەندامەکانیان پەیوەندی بکەن بە حیزبی نیشتمانی دایکەوەو هەندێکی تریشیان بە حیزبی ڕێگای ڕاستەوە، گۆڕانکاری‌یەکان بەردەوام بوون و حیزبی گەلیش ساڵی ١٩٨٣ تێکەڵاو بە حیزبی سۆسیالیستی دیموکراتی بوون بە سەرکردایەتی

(بوڵند ئەجەوید)، بێگومان تا ساڵی ۱۹۸۷که ساڵی گەڕانەوەی حیزبەکان بوو بۆ گۆڕەپانی سیاسی و هاتنەوە بەر چاو، ئەمەش ئۆزالی ناچارکرد پرۆسەی هەڵبژاردنی پەرلەمان رابگەیەنێ، وە لە تشرینی دووەمی ۱۹۸۷ ئەنجامی هەڵبژاردن راگەیەنرا بەم شێوەیە بوو:-

حیزبی نیشتمانی دایك ۳٦,۳٪

حیزبی سۆشیالیستی دیموکراتی ۲٤,۸٪ (ئەردال)

حیزبی رێگای راست ۱۹,۲٪ (دیمیریل)

حیزبی چەپی دیموکراتی ۸,۵٪ (ئەجەوید)

ئەم هەڵبژاردنە تاقیکردنەوەیەکی گرنگ بوو، وە سەلماندی کە سەرکردە کۆنەکانی وەك (دیمیریل و ئەجەوید) لە بەردەم سەرکردە نوێیەکانی وەك (ئۆزال و ئەردال) هەرەسیان هێنا. ساڵی ۱۹۸۹ هەتاکو ساڵی ۱۹۹۲ تورکیا چەند گۆڕانکاریەکی گرنگ و زیندووی بە خۆیەوە بینی:

۱- بەرفراوان بوونی سیستەمی سیاسی - لیبرالی ، ماوەی بەند بوون بۆ لێکۆڵینەوە لە (۱۵) رۆژ کرایە (۲٤) کات ژمێر، چەند چاکسازیەکی دەستووری لە ناو پەرلەماندا کراو ژمارەی پەرلەمانتارەکانیش زیاد کرا. وە هەڵبژاردن بۆ سەرۆك کۆماری کرایە هەڵبژاردنێکی راستەوخۆ بێ‌دەست تێوەردانی هیچ لایەنێك و مافی هەڵبژاردنیش زیاتر کرا تاوەکو تەمەنی ۱۸ ساڵانەش بگرێتەوە.

پەرلەمان توانی مادەی ۱٤۱ ،۱٤۲، ۱٦۳ ی ناو دەستوور هەڵبگرێ کە لە دژی چالاکیە سیاسیەکان بوو، حیزب و گروپ و تاقمە سیاسیەکانی کە لە سەر بنەمای چینایەتی و ئایینی پێك هاتبوون،کەوتنەوە گەڕو هاتنەوە مەیدان و دەست بەکاربوونەوەی سەندیکای (DISK) کە ۱۱ ساڵ بوو چالاکی لێقەدەغە کرابوو.

۲- گەڕانەوەی دیمیریل بۆ سەر حوکم ئەمەش یەکێك بوو لە دەست کەوتەکانی هەڵبژاردن.

٣- گۆڕانكاری لە بەرەكانی چەپ دا بە گەڕانەوەی حیزبی گەلی كۆماری بە سەركردایەتی (دینیز بایكال).

پاش سەرنەكەوتنی حكومەتەكەی (بولنت ئەجەوید ساڵی ١٩٧٩)و لە جێبەجێ نەكردنی سندوقی نەختینەی دەولی - صندوق النقد الدولی_ دەستە وەستان بوو لە چاككردنی باری ئابووری و دارایی، وە لە ساڵی ١٩٨٠ بەدواوە هیچ هەنگاوێكی تازەتر نەنرا لە لایەن حكومەتی (سلیمان دیمیریل)وە، مانگرتن و خۆپیشاندانەكان دەستی پێكردو پێكدادان لە نێوان كرێكاران و هێزەكانی پۆلیس رووی دەدا بە بەردەوامی.

لەكاتی بەرپابوونی كودەتاكەی ساڵی ١٩٨٠ و پاش دەست بەسەرا گرتنی یەكێتی یە كرێكارییەكان لەلایەن سوپاوە، دەبوایە بەرنامەی جێ بەجێكردنی (سندوقی نەختینەی دەولی) جێ بەجێ بكرایە ئەوسا ئەم پرۆسەیە ناوی لێنرا بوو جێگیركردنی ئابوری - (التثبیت الاقتصادي)، سەرۆكی بانكە جیهانییەكان و سەرۆكی سندووقی نەختینەی دەولی و بازرگانە گەورەكان دەیانویست متمانە بگەڕێنەوە بەتوركیا، دەرگای قەرز دانیان بۆ خستە سەرپشت هەر لەساڵی ١٩٨٠دا قەرزەكانی لە ١٣,٥ ملیارەوە گەیشتە ٤٠ ملیار دۆلار ئامانجی صندوقی نەختینەی دەولی، چاككردن و باشتركردنی گوزەران بوو تا بتوانن دیاردەی هەڵئاوسان - (التضخم) ڕابگرن و بازاڕێكی ئازاد بخولقێنن لەسەر بنەمای ناردنە دەرەوە (التصدیر)، بەڵام باری ئابووری ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو خراپتر دەڕۆی و نرخی لیرەی توركی بەشێوەیەكی بەردەوام دەهاتە خوارێ یارمەتیو پاڵپشتی حكومەت بۆ پرۆژەكان كەم بۆوەو نرخی شت ومەك بەرز بۆوە، پارەو پول بۆ وەبەرهێنانی (الاستثمار) پیشەسازی تەرخان نەدەكرا پارەو پول لای قاچاخچیو مشەخۆرەكان كەڵەكە دەبوو وای لێهات ئەم كەسانە ڕۆڵی بانكەكانیان دەبینی دانیشتوان پارەكانیان لای ئەمان دادەنا بەرامبەر بەوەرگرتنی سوود (الفائدة) وەكاتێك حكومەت لەساڵی ١٩٨١ دەستی گرت بەسەر ئەم كۆمپانیا

مشەخۆرانەدا بەجارێك (٣٠٠) کۆمپانیـا هەرەسـی هێنـا هـەندێکیش لـەو کەسـانە هەڵاتن بۆ دەرەوەی وولات.

حکومـەت خـودی خـۆی هـانی ( وەبەرهێنـەرە - المسـتثمر ) بیانیـیـەکانی دەدا ئاسان کاری بۆ دەکردن و بەئاسانی قازانج و سەرمایەکانی بۆ دەگواستنەوە هـەر لەوسـەردەمەدا چـوار ناوچـەی بازرگـانی گـەورە پێـك هــات لەدەوروبـەری کەنارەکانی (ئەزمیرو میرزن) نزیك شاری ئەدەنە کاری ئـەم کۆمپانیـاو مەڵبـەندە بازرگانیانە دروست کردنی بینـاو ڕێگاوبـان و کـارە خزمەتگوزارییـەکانی تریـوو. بەڵام حکومەت پارەو پولی پێویستی نەبوو بیداتە ئەم کۆمپانیانـە لـەبری کردنـی ئیش و کارەکان بۆیە زۆربەی پرۆژەکانی بە سیستەمی (B.O.T)[1] بەڕێوەدەچوو. کارەکانیان بۆ حکومەت بەئەنجام دەگەیاند، بەتـەواوبوونی ئـەم پرۆژانـە تورکیـا جـم و جۆڵێکـی (سیاحی) بـەخۆوە بینـیو بـووە هـۆی ئـەوەی بیانیـەکی زۆر لەزۆربەی وڵاتانەوە سەردانی ئەم شوێنانە بکەن.

کۆتای هەشتاکان پرۆژەیەکی گەورە بەناوی (GAP) ئەنجام درا بۆ دروست کردنی چەند بەربەستێك لەسەر ئاوی دیجلەو فورات و بۆ بەرهەم هێنانی ووزەی کارەباو عەمبارکردنی ئاو بەبڕی (١,٦) ملیۆن هکتار، ئەو ناوچانەی کە سوودمەند دەبـن لـەم پرۆژەیـەدا زیـاتر ناوچـەکانی خـواروی ڕۆژهـەڵاتی ئـەناضوڵن زۆربـەی دانیشتوانەکانیشی لەکورد پێك هاتوون و باری گوزەرانیان زۆرکزەو هەژارن.

---

[1] B.O.T :- کورت کراوەی ووشەی (Build. Operate. Transfer) مەبەست لـەم نیزامـە دروسـت کردنی پـرۆژە پیشەسازییەکانە بـێ ئـەوەی تێچـوون (کلفـة) بکەوێتـە سەرشـانی حکومـەتی تورکی واتە ئەو کۆمپانیایەی هەڵدەستێت بەکارەکەی بەپارەو پوولی خـۆی کارەکـە دەکـات و ئەنجامی ئەدات و دوای تەواو بوونی کارەکان پرۆژەکان لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا دەبێت و نرخ بەدەست خۆی دەبێت وەبڕی قازانج هەر بۆ خـۆی دەگەڕێتـەوە هـەتا هـەموو بـڕی ئـەو پـارە سەرف کراوەی چنگ بکەوێتەوە.

ئەوەی ڕاستی بێت لەدوای ئەو هەڵكشـان و داكشـانە ئابوورییـەی تووشـیان بـوو لەماوی ساڵەكانی ١٩٨٠–١٩٨٨ توانرا زۆربەی بەرنامـەكانی چاكردن و ئـابووری جێبـەجێ بكرێت و ئامانجـەكانی خـۆی بەدەسـت بێنێت. وە تێكڕایـــی ڕێـــژەی نێردراوەكان زیـاد بكـەن بـۆ (٢٢٪)، كـۆی داهـاتی نێردراوەكـان لەسـاڵی ١٩٨٨ زیـادی كـرد بـۆ (١١,٧٪) ملیـار دۆلار بەبـەراورد كـردن لـەچاو سـاڵی ١٩٧٩ كـە داهاتی نێردراوەكان تەنها (٢,٣٪) ملیار دۆلار بوو.

بۆ گەشەسەندن و هەستانەوەی توركیا هەتا ساڵی ١٩٨٩ زیاتر گرنگـی بەلایـەنی پیشەسازی دەدراو پێش دەخرا وە ناردنە دەرەوەی بەرهەمـە پیشەسـازیەكان لەچاو نێردراوە كشتوكاڵیەكاندا بەشێوەیەكی بەچاو زیادی كرد، ڕێژەی نێردراوە كشتوكاڵیەكان (٢٠٪) بوو كەچی ڕێژەی نێردراوە پیشەسـازیەكان گەیشـتبووە (٧٢٪).

وە لەنیوەی یەكەمی هەشتاكاندا تێكـڕای گەشەسـەندنی بەرهەمـە ناوخۆییـەكان (٤,٥٪) بوو بەلام لەساڵەكانی ٩٨٦ – ٩٨٧ بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخـی نـەوت لەجیهاندا ئەم ڕێژەیە زیادی كرد بۆ (٧٪ و ٨٪).

# ئیسلامی سیاسی لەپاش كۆدەتای ١٩٨٠ لە ئۆزالەوە بۆ ئەربەكان

شەش ڕۆژ دوای كودەتای ١٩٨٠ حیزبی (السلامة الوطـني) – ئیسـلامی لـەژێر سەرپەرشـتی نەجمـەدین ئەربـەكان ڤیسـتیڤاڵێكی بـەناوی (ڤیسـتیڤاڵی – قودس) وە سازدا، وە دروشمی ڕزگاركردنی قوودسیان بەرزكرد بـۆوە و نزیكـەی سەد هەزار كەس بەشداربوون تیایدا، چەندین دۆست و لایەنگری حیزب بەبـەرگی ئـایینیو ئـالای سـەوزەوە ئامـادەبوون چـەندین ووتـارو هوتـاف لـەدژی نـــیزامی عیلمانی دەبیستراو بانگەشەی ڕووخانی ئەو نیزامەو دروسـت بوونـی دەوڵـەتێكی

ئیسلامیان دەکرد، ئەمە بووە هـۆی ئـەوەی سـەرۆکی کۆدەتـا (کنعـان ئیڤرین) هەستا بە لەکار خستنی تێکڕایی حیزبە سیاسیەکان و گرتنی سـەرۆکەکانیان و دادگایی کردنیان لە پێش هەموویانەوە حیزبی (سـەلامەتی نیشتمانی) بـوو کـە ئەربەکان سەرکردایەتی دەکردن.

سەرۆکەکانی ناو سوپا بیریان لە دروست کردنـی سیاسـەتێکی تـرو دەسـتورێکی تازەتر کردەوە بۆ پاوان کردنی وەزعی ناوخۆ دوای هەڵبژاردنەکەی سـاڵی ١٩٨٣ بەسەرۆکایەتی (تورگۆت ئۆزال) حزبی (نیشتمانی دایك) یـان پێـك هێنایـەوە تـا ڕابەرایەتی حکومەتێکی مەدەنی بکـات بەمـەرجێك سـەرۆکی دەوڵـەت (جەنـەراڵ ئیڤرین) بێت، هەر لە ساڵی ١٩٨٢دا دەستورێکی گشتی داناو سوپا توانی دەست بگرێتەوە بەسەر ژیانی سیاسیدا لەژێر سایەی یاسا سەربازییەکاندا سەرۆکەکانی کۆدەتاچیەکانی ساڵی ١٩٨٠ ڕووبەڕووی کێشـەیەکی دوولایەنەبوونـەوە بەرامبـەر مامەڵەکردنی ئیسلامیە سیاسیەکان:

لایـەنی یەکـەم: سـەرۆکەکانی کۆدەتـا کـاتێ دەیانویسـت دەسـەڵاتی تـەواویان بەسەر کۆمەڵگادا هـەبێ و ئـەو کاتـە حکومـەتی تورکیش دەسـتە وەسـتان بـوو لەئاست ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا، (ئیسلام)یان وەك ئایدۆلۆجیەتێکی ڕەسمـی نـاو دەبردو کار دەگەیشتە ئەو ڕادەیەی جەنراڵ ئیڤرین سـەرۆکی کۆدەتـا بـەناچاری پەنای دەبردە بەر ئایەتی قورئان و فەرموودە پیرۆزەکان و لەدەستووری سـاڵی ١٩٨٢ وانـەی ئـایینی کـردە وانەیـەکی ئیلزامـی نـاو پـەیڕەوی خوێندنگاکانـەوە.

نووسەری ئیسلامی تورکی (یشـار کیبـلان) لـە کتێبەکـەی بـەناوی (شـەش سـاڵ گرتن) ئاماژەی بۆ ئەم حاڵەتە کردووە دەڵێ:

( سەرۆکەکانی کۆدەتای ٩٨٠ ئیسلامیان تەنها بـۆ ئـەو مەبەسـتە دەوویسـت کـە بیکەنـە زەمانـەتێك بـۆ مانـەوەی نیزامەکـەیان لـەدژی هێرشـی چـاوەڕوانکراوی کۆمۆنیستەکان ).

لایـەنی دووەم: سـەرۆکەکانی کۆدەتـا هەسـتیان بەمەترسـی ئیسـلام کـرد وەك ئایدۆلۆژیایەك و وەك جووڵانەوەیەك کەلە ناو کۆمەڵگای تورکیدا ڕەگی داکوتاوە

بێگومان ئەمەش دەبووە ڕێگرێك لەبەردەم مەرامەکانیان درکیان بەو واقیعە کـرد کە ئیسـلامیەکانیش وەك ئایدۆلۆجیایـەکی جەوهـەری دەسـتەیەك دەبـن بـۆ سیستەمی داهاتوو، ناچار ویستیان ئیسلام بکەنـە بەشێك لـەو سیسـتەمە بـەلاّم تـەنیا لـە ڕووبەڕوونـەوەی بزووتنـەوە کۆمۆنیسـتیەکان و جولاّنـەوەی کـوردیدا بتوانن بەکاری بهێنن، نەك وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ سیستەمی داهاتوو.

# ئۆزال و موسڵمانگەراییەکی میانڕەو

نووسەری تورکی (ئەرتیگرول کیرکۆ) لە نووسینەکەیدا بەناوی (دابـەش بوونی تورکیای ئەتاتورکیو ئیسلامیەکان) باس لە ناشتنی تەرمی تۆرگوت ئۆزال دەکا ڕایدەگـەینێ بـەوەی لەسـەرەتای سـاڵەکانی (١٩٩٠)وە هەڵسـووکەوتێکی ئیزدواجیانـە دەبیـنرێ لـەنێوان دەوڵـەت و کۆمـەڵگای تورکـیدا، ئـەم هـەڵس و کەوتانـەش لـەکاتی ناشـتنی تەرمەکـەدا دەبیـنرا لـەو کاتـەی کەلـە ئەنقـەرەوە تەرمەکە بەڕێخراو تیپی ئوکسترای سەربازی لـەدوای تەرمەکـەوە مارشـی مردنـی عـەزف دەکـرد لەسـەر شـەقامە گشـتییەکی پایتـەخت (شـەقامی ئـەتاتورك) خـەڵکێکی زۆر وەسـتا بـوون لـەو پێشـوازییەدا بـێ دەنـگ بـوون وە هیـچ کاردانەوەیەکیان بەرامبەر ئەم مەراسیمە ماتەمینییە نەبوو کەزۆربەیان لەخەڵکی موچەخۆری حکومی پێك هاتبوون کەچی پێچەوانەی ئەمە لەشـاری ئەسـتنبول و لەنوێژی هەینیدا سەدەها هەزار کەس بەدەنگی (الله اکبر)ەوە بـەرەو گۆڕسـتان بەڕێکەوتن... تورگۆت ئـۆزال کەلـە سـاڵی ١٩٨٣ بـووە سـەرۆك وەزیـران، یەکـەم سـەرۆکی حکومـەت بـووە کـە سـەردانی مـاڵی خـوای کـردووە وە بەشـێوەیەکی بەردەوام بەشداری نوێژەکانی هەینی کردووە یەکێك بووە لە پـەیڕەوانی ڕێبـازی نەقشبەندی هەڵگری داب و نەریتەکانیشی بووە.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەو ماوەیەی ئۆزال سەرۆکی حکومەت بـوو (٩٨٣-٩٨٩) وە کـاتێکیش سەرۆکی وولاّت بـوو هـەتا ڕۆژی گیـان سـپاردنی -١٩٩٣، پـەیڕەویی

ئیسلامی میانڕەوی دەکرد، ئاواتە خوازی ڕێکخستنەوەی ئیسلام و ئەتاتورکیەکان بوو پاش کودەتاکەی ساڵی ١٩٨٠ ماوەی گرتنە دەستی حوکم لەلایەن ئۆزالەوە یارمەتیەکی زۆری خوێندگاکانی ( ئیمام - خەتیب)ی‌دا، بەهۆی ئەم پشتگیری لێکردنەیەوە ڕێژەی دەرچووانی ئەو ساڵە لەچاو ساڵانی پێشوودا لە ٢٠٪ زیادی کرد، بەوەزارەتی پەروەردەی ڕاگەیاند کەتیورەکانی (داروین ) لەوانەکانی سەرەتایی‌و ناوەندیدا هەڵگیرێت. ڕێگای بە ئافرەتان دا تابەرگی ئیسلامی بپۆشن ڕێگای لەبەردەم ئێستگەو تەلەفزیۆن و چاپەمەنیەکاندا واڵاکرد ڕێنماییو کارە پێویستی‌یەکانی خۆیانی تیا جێ بەجێ بکەن، ساڵی ١٩٨٣ بەپێی یاسایەکی تایبەت (دامەزراوی ئەوقافی)دامەزراند بەهۆی ئەم یاسایەوەئیسلامی‌یەکان سوودێکی زۆریان لێبینی لەپێشخستنی چالاکیەکانیان هەر لەماوەی حوکم کردنی ئۆزال دا بەهۆی ئەو سیاسەتە ئابووری‌یە لیبرالیەی پەیڕەوی دەکرد هەلێکی مێژووی لەبار دروست بوو بۆ کۆمپانیا بازرگانیەکان و پرۆژە ئیسلامیەکان، یەکەم پرۆژەی (تمویل اسلامي) دامەزراند بەناوی (البركة ترك) بەگەورەترین بانکی تورکی دادەنرا بەبێ سوود - فائدة پارەی ئاڵوێر دەکرد. تورگۆت ئۆزال مۆڵەتی‌دا بە چالاکیەکانی (یەکگرتووی جیهانی ئیسلامی - رابطة العالم الاسلامي) لەناو تورکیا. لەناو بینای پەرلەماندا مزگەوتێکی بچووکی دروست کرد، مەڵبەندێکی ئیسلامی بەناوی (زانکۆی تەکتەلۆجی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) دامەزراند جگە لە جێگیرکردن و چەسپاندنی زمانی عەرەبی لە زانکۆکاندا، هەروەها چەندین پرۆژەی بەکەڵکی لە ئەزمیرو ئەدەنەو شارەکانی تردا بەئەنجام گەیاند. ئەو سیاسەتە میناڕەوە ئیسلامیەی تورگوت ئۆزال بەتەنها بەربەستێك نەبوو لەبەرامبەر زیادەڕۆی ئەتاتوورکەکان، بەڵکو سنوورەکانی تورکیاشی بەزاند، پاش سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی ئێران ١٩٧٩، بەئاشکرا ڕای گەیاند کە پشتگیری لە شۆڕشی ئێران دەکەین چونکە چەکێکی کاریگەرە بۆ لێدانی ڕۆژئاواو عیلمانیەکان، هەروەها شۆڕشی ئێرانیش کاردانەوەی خۆی هەبوو

یاریدەدەرێکی مادیو مەعنەوی بوو بۆ جولانەوە ڕادیکالیەکان بەتایبەتی سوپای ڕزگاری ئیسلامی - جیش التحریر الاسلامي لترکیا، و حیزب الله.

OZAL

ئـوزال لـــە ووتەکـانیدا ڕایەگەیانـد بـوو کـە هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و هەڵگیرساندنی جەنگی کەنـداو، ڕێخوشکەرێکن بۆ تـورکیا تـا پێکهاتەی خۆی بنیاتنێتەوە لەڕێگای بیرۆکـەی (ئیسلامەتیەکی میانڕەوە)وە. ئەم دوو ڕووداوەی سەرەوە هەلێکی باشە بۆ تـورکیا سەر لەنـوێ ڕۆڵـی خۆی بگێڕێتەوە بۆ نـاوچەکـەو، دەبێـت پێگەیەکی گونجاوترو کـاریگەر تـری ببێت لـە کاروبارە بازرگانیەکاندا - خوازیاری ئایدۆلۆجیەکی بـەرفراونتر بـوو کـە لەمەسـەلەی ( ئـەتاتورکی نەتـەوەیی ) گـەورەتر بێـت، ئـەو ئایدۆلۆجیەتەی خوازیاری بـوو بریتـی بـوو لـە (نەزعەیـەکی ئیسـلامی میـانڕەو - النزعة الاسلامیة المعتدلة ) کە هەردوو هزری سەرمایەداریو ڕۆشنبیری بـەهاکانی ئیسـلام بەیەکـەوە گرێبـدات، ببێتــە شــوورەیەك تــورك و کــوردو ئــازەریو ئۆزباکیەکان و کەمینەکان بگرێتە خۆ.

تێڕوانینـەکانی ئـوزال لـەبارەی (ئیسـلامی میـانڕەو) لـەدوای گیـان سـپاردنیەوە کۆتایی هات وەئەڵتەرناتیڤی ئەمیش (ڕەفای ئیسلامی) بوو،...

کـاتێك سیسـتەمی عیلمـانی هێرشـی کـردە سـەر ئەربـەکان لـەدوای فیسـتیڤاڵی قوودس و دوای ڕاپێچ کردنی بۆ زیندان خۆیو (٢٤) هەڵسوڕاوی حیزبەکەی لەبەر دادگـای عورفـی سـەربازیدا خۆیـان بینیـەوە بـەتاوانی بـەکارهێنانی ئــایین بـۆ مەبەسـت و مـەرامی سیاسی، پاشـان کەوتنـە ژێـر لێکۆڵینـەوە. ئـەو کەسـانەی کەمابوونـەوەو نـەگیرابوون بیریـان لەدروسـت کردنـی حــیزبێکی تــازە کــردەوە لەجیاتی حیزبە کۆنەکەی خۆیان (السلامة الوطني) تا کـاری خۆیـانی تیـا بکـەن، ئـەم حیزبـەیان گــۆڕی بــەحیزبی ڕەفـا بەسـەرکردایەتی (ئەحمـەد تـەقدال )

بەرەزامەندی ئەربەکان و سەرۆکەکانی تری ناوحیزبەکەیان، وە لەراپرسیەکەی ساڵی ١٩٨٦دا نەجمەدین ئەربەکان سەرۆکایەتی حیزبی رەفای گرتە دەست، حیزبی رەفا بەرنامەی خۆی خستە روو لەژێر ناوی (سیستەمێکی دادپەروەردا - النظام العادل) مەبەست لەم سیستەمە (سیستەمی ئیسلامی) بوو، بۆ چاوبەست کردن لەحکومەت ئەم ناوەیان هەڵبژارد تاکو یاساو دەستورەکانی دەوڵەت رێگایان لێنەگرێت لەکارو چالاکیەکانداو بەئازادی هەڵسوورێن.

ئەم پرۆژەیە نەتوانرا بەشێوەیەکی بەرچاو و پێویست بخرێتە روو تا هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩١، دامەزرێنەری ئەم بەرنامەیەش ئەندازیار (سلیمان قەرەگۆل) بوو بەهاوکاری دوو کەسی تری ناو رەفا کەبریتی بوون لە (دکتۆر عارف رصوی‌و دکتۆر سلیمان ئەقدەمیر)، بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە (سیستەمی دادپەروەری) سلێمان قەرەگۆل بەم شێوەیە پێناسی دەکات (جیهان دوو تێروانینی هەیە تێروانینی خاوەن دەسەڵاتەکان، تێروانینی بێهێزەکان لێرەدا دەسەڵاتداران تێدەکۆشن بۆ نەمانی بێهێزەکان ئەمەش لەبەر رۆشنایی هەڵبژاردەکاندا بەئاشکرا دیارە لەم بەرئەنجامەوە دەسەڵاتدارەکان هێزی خۆیان دەسەپێنن، بەڵام لەبەرامبەر ئەمەدا هێزێك هەیە لەهەناوی پەیامە ئاسمانیەکانەوە هاتۆتە دەری‌و سیستەمێکەو پشت بەحەق و راستی دەبەستێ) ئەمە مانای وایە دوو سیستەم بوونی هەیە یەکەمیان پشت بەدەسەڵات و دەست بەسەراگرتن و چەوساندنەوەو یاسا ناوخۆیی‌یەکان دەبەستێ تیۆری دووەمیش پشت بەحەق و تێکۆشانی خودایی دەبەستێ، یەکێك لەبەندەکانی بەرنامەکەیان بەرپەچدانەوەی عیلمانیەتی تورکی بوو، ئەربەکان دەیووت عیلمانیەتی تورکی جیاوازیەکی تەواوی هەیە لەگەڵ عیلمانیەتی رۆژئاوا، لەوێ واتە لە وڵاتانی رۆژئاوا، ئایین جوودایە لەکارو بارەکانی دەوڵەت، دەوڵەت دەست وەرنادات لەکاروباری ناو کەنیسەکان، وە بە پێچەوانەشەوە کەنیسەکان پەیوەندیان نیە بەدەوڵەتەوە کەچی لەتورکیا لەسەر بنەمای یاساو دەستوور بۆیان هەیە دەست

وەردەنە هەموو کاروبارە ئایینیەکان وەئـەتوانێ کـارو چالاکیـەکانیان لێقەدەغـە بکەن، واتە بەناوی عیلمانیەتەوە پەیڕەوی سیاسەتێکی سەرکووت کەرانە دەکەن.
وەلەبارەی دیموکراتیەتەوە سلیمان قەرەگول دەڵێت:—
دیموکراتیەت تەنها بریتی‌نیە لەهەڵبژاردنەکان هەر بە پێنج ساڵ جارێك وبڕوامـان بەو زۆرینەیەنیە کەلە ئاکامی هەڵبژاردندا دێنە سەر حوکم، لـەبری ئەمـە بڕوامـان بـە ئیئتلافێکـی نیشـتمانی هەیـە، هـەڵبژاردن شـێوازێکی پێشـەکەوتووی هـێزە دەسەڵاتدارەکانەو خەڵکی پێدەترسێنن و خەڵکیش لەترساندا هەڵیان دەبژێرن.
هەر لەم بارەیەوە ئەربەکانیش دەڵێ:
پێویستە ئەوەمان بیر نەچێتەوە کە دیموکراتیـەت مـەرام و مەبەسـت نیـە بـەڵکو تەنها ناوەندێکە، مەرام و مەبەستی ڕاستەقینە لای ئێمە بنیاتنانی سیستەمێکی بەختەوەرانەیە، لەژێر ناوی دیموکراتی‌دا یەکێك هەڵدەبژێرێت و یەکێك فـەرامۆش دەکرێ ئەمەش جۆرێکە لە ناڕەوایی دەبێتە هـۆی دروسـت بوونـی سیسـتەمێکی ستەمکارانە...
لەلایەنی ئابووریشەوە ئەربـەکان دەڵێـت: ئـەو سیسـتەمەی نـاوی (سیسـتەمێکی دادپـەروەر)ە هیـچ جـۆرە (سـوویەك - ربـا)یەکی‌تیانیـە نـەباج و نـەگومرگی تیـا نابینرێ قەرز دەدات بەهەموو کەسێك بەشێوەیەکی ڕێك و پێـك، ئـەم سیسـتەمە کۆتایی بەبێ کاری دەهێنێت نرخـی شـت و مـەك دێنێتـە خـوارەوە بەرهەمـەکان سـێ ئـەوەندەی ئـەمڕۆ زیـاتر دەکرێـن تـاوای لێدێـت تورکیـا ببێتـە گرنگـترین و بەهێزترین دەوڵەت.
وەلەبارەی پەیوەندییەکانی دەرەوە: بەپێی بەرنامەکانی ساڵی ۱۹۹۱ی حیزبی ڕەفا بەم شێوەیە باسی پەیوەندیـەکانی کـردوە مەبەسـتی سـەرەکی تورکیـا لـە پەیوەندییـەکانی دەرەوە بریتـین لەهـەوڵدان بـۆ پێکـەوەنانی ڕێکخراوێکـی نەتەوەیی یەکگرتووی ئیسلامی، یادروست بوونی ڕێکخراوێکـی هاوبـەش بـەرگری لە مافە ئیسلامیەکان بکات وەیان هەوڵدان بۆ پێك هاتنی ڕێکخراوێکی هاریکـاری ڕۆشنبیری دەوڵەتە ئیسلامیەکان لەوێنەی ڕێکخراوی (یونسکۆ) ی جیهانی، ئیدی

فۆرمەلەی (سیستەمی دادپەروەری) بووە نموونەی گوتاری سیاسی حیزبی ڕەفای ئیسلامی.
هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥ حیزبی ڕەفا پلەی یەکەمی بەدەست هێنا بەڕێژەی ٢١,٣٨٩٪ لەدەنگەکان ژمارەی کورسیەکانیان لەناو پەرلەمان گەیشتە ١٥٨ کورسی لەکۆی ٤٥٠ کورسی لەژێر کاریگەری هەڵبژاردنەکاندا حکومەتێکی ئیئتلافی دامەزرا بەسەرۆکایەتی مەسعود یەڵماز (حیزبی نیشتمانی دایك) وە بەهاوبەشی تانسۆ تشیلر (حیزبی ڕێگای ڕاست) بەڵام ئەم حکوومەتە ئەوەندە درێژەی نەکێشاو ساڵی ١٩٩٦ هەرەسی هێنا، ئەمەش هەلێکی مێژوویی لەبەردەم حیزبی ڕەفادا ڕەخساند یەکەم جار بوو لە مێژووی نوێی ترکیا حکومەتێکی ئیسلامی دامەزرێ، وەنەجمەدین ئەربەکان سەرۆکایەتی دەکرد هەمان سیاسەتی ئۆزالی پەیڕەو دەکرد وەك ئیسلامێکی میانڕەو هاتە مەیدانەوە، ئەم گۆڕانکارییە ڕێگای بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەی (سیستەمی دادپەروەری) ئاسانتر کرد.

# (ململانێی ئەتاتورکەکان و ڕەفای ئیسلامی)

لەهەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٥ حیزبی ڕەفا لە ٢١٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا بەهۆی ئەو بۆشاییەی لەدەسەڵاتدا پەیدا بوو هەردوو حیزبی ڕێگای ڕاست، باڵی ڕاسترەو بەسەرۆکایەتی تشیلر لەگەڵ حیزبی گەلی کۆماری چەپڕەو بەسەرۆکایەتی دینیز بیکال ناچار بوون ئیئتلافێك پێك بهێنن، ئەمەش کۆتایی بەم بۆشاییە نەهێنا، پاش ئەمە حکومەتێکی ئیئتلافی تر دروست بوو لە نێوان حیزبی (نیشتمانی دایك) بەسەرۆکایەتی مسعود یەڵماز و حیزبی (ڕێگای ڕاست) بەسەرۆکایەتی تشیلر، وە لەئاکامدا کێشەو ناکۆکی لەنێوان یلمازو تشیلر سەری هەڵداو یەڵماز تشیلری بەوە تاوان

بار دەکرد کە سەرچاوەی فەسادە لە وولاتدا، هەروەها لەم ناکۆکیەدا ئەربەکانیش پشتگیری لە یەڵماز دەکرد داوای لە پەرلەمان دەکرد لێکۆڵینەوە لەگەڵ تشیلردا بکرێ، بەرەنجام ئەم حکومەتەش داڕماوو ئەم ئیئتلافە پووکایەوە، وەزعی تورکیا ڕووبەڕووی سێ حاڵەت بۆوە ..!!

—گەڕان بەدوای حکومەتێکی نوێدا

—هەڵبژاردنێکی نوێ

—دەستێوەردان و هاتنەوە ناوەوەی سوپا

ئەم جارەیان ئیئتلافێکی تازەتر ڕوویدا لەنێوان ئەربەکان و یەڵماز، یەڵماز خۆی ئەم ئیئتلافەی پێ باش بوو چونکە لەناو حیزبەکەیدا مینبەرێکی ئیسلامی تیابوو.

بۆشایی دەسەڵات لەساڵی ١٩٩٥ وەتاکو ساڵی ١٩٩٦ بەردەوام بوو ئەوەی لێرەدا جێگای مەبەستە تێڕوانینمانە بۆ حیزبی ڕەفا پێچەوانەوەی ئەو باوەڕەی خەڵك هەیبوو بەرامبەر حیزبی ڕەفا، ئەوان نەحیزبێکی ئوسولین و نەسەلەفیشن جیاوازییەکی بەرچاویان هەیە لەچاو باقی حیزب وڕێکخراوە ئیسلامیەکانی ناو دەوڵەتە عەرەبیەکان، پاش لێکۆڵینەوەو وردبوونەوە لەهەڵبژاردنەکاندا لە (٤١٪)ی ئەو کەسانەی دەنگیان بۆ حیزبی ڕەفا دابوو لە عیلمانیەکان پێك هاتبوون، وە لە (١٧٪) ئەو کەسانەی بڕواومتمانەیان بەسوپا هەبوو بەڕەمزی عیلمانیەت لەقەڵەم دران...

لەو سەردەمانەدا حیزبی ڕەفا نەیدەویست جێ بەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام بکاتە بەرنامەیەکی هەنووکەییو دەست بەجێ، سەقامگیرکردنی سەد دەرسەدی ئیسلامەتی بەرنامەی دوورو دوا ڕۆژیان بوو ئەوەی بەنەزەری ئیعتبار وەریان دەگرت پرنسیبەکانی دیموکراتیەت و ڕێزگرتن بوو لەمافی کەسەکانی گەلی تورك خیتابی سیاسی حزبی ڕەفا لە ڕەفتارو خووڕەوشتە سوونەتیەکانی کۆمەڵگای تورکیەوە سەرچاوەی دەگرت، دادوەری کۆمەڵایەتی ئامانجیان بوو، دژی کەوتنەدوا - التبعیة‌ی کوێرانەی ڕۆژئاوا بوون. ناڕازی بوون بەوەی ئیسلام دەست

بگرێت بەسەر تەواوی گۆڕەپانی سیاسی‌دا، (ئیحسان داغی) یەکێکە لەمامۆستاکانی زانکۆی تەکنەلۆجی لەئەنقەرە وە مامۆستا وانەی (پەیوەندیە دەولیەکانە) دەڵێت: لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سیستەمی سیاسی تورکیا لە تاك حزبی‌یەوە بۆ فرەحیزبی، کە ئەمە ساڵی ٩٤٥ لەزەمەنی سەرۆك (عیسمەت ئینۆنۆ)دا ڕووی‌دا، چالاکی ئیسلامیەکان بەشێوەیەکی بەرچاو ڕوو لەزیادی کرد، چاودێرە ڕۆژئاوایی‌یەکان ئەمەیان ناونا (ڕابوون - صحوة)ی ئیسلامی. وەحیزبی دیموکراتی کە (مەندریس) سەرۆکایەتی دەکرد ڕێگای دا بەپێشکەش کردنی بەرنامەی ئایینی لە ئێستگەکانداو فەرمانی‌دا (بانگ دان) بەزمانی‌عەرەبی بێت کەلەمەوپێش قەدەغە بوو، هەروەها فەرمانی دەرکرد بەکردنەوەی دەرگای مەزاری پیاوچاکان.

ئەمەی حیزبی دیموکراتی کردی هاوسەنگیەکی‌دا بەوەزعەکان لەڕێبازی (ئەتاتورکیە زیادەڕۆکان)ی کەم کردەوە، توانیان هەریەك لەداب و نەریتە ئیسلامیەکان و ڕیفۆرفمە عیلمانیەکان لەتای تەرازوویەکدا ڕاگرن. لەگەڵ ئەمەشدا حیزبی دیموکراتی توانی چەند چین و توێژێکی نوێ، کەلە جوگرافیای نیشتمانەکەیاندا لەپەراوێزدا بوون بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە لەپاڵ چین و توێژە ئیسلامیەکاندا ڕیزبەندی‌یان بکات. لەتورکیا تا ساڵی ١٩٦٠ هێزی کێش کردن بەرەو ئیسلامەتی بەردەوام بوو، لەو بارودۆخە نەجمەدین ئەربەکان توانی خۆی بەخەڵك بناسێنێ وەلەساڵی ١٩٧١ حیزبی (سەلامەتی نیشتمانی) دامەزراند بوو لەساڵی ١٩٧٣،١٩٧٧ توانی بەشداری هەڵبژاردنەکان بکات هاوبەشی لە حکومەتە ئیئتلافیەکاندا بکات لەو ماوەیەدا زیاتر خیتابە سیاسیەکانی ڕووبەڕووی ڕۆژئاواو سیستەمی سەرمایەداری دەکردەوە، تاکو ساڵی ١٩٩١ حیزبی ڕەفا بەشداری هەڵبژاردنەکانی کردەوە بەهاوبەشی لەگەڵ حیزبە نیشتمانیە ڕاستڕەوەکاندا وەلە ١٧٪ی بەدەست هێنا، بەسوود وەرگرتن لەو بارە ئابووری‌یە ناهەموارەی تورکیای تێکەوتبوو وە قۆستنەوەی ئەم حاڵەتە بۆ سەرکەوتنە سەر کورسی حوکم.

# خەونەکانی ئەربەکان

هەرلەبیستنی پێك هێنانی حکومەتێکی نوێ لەلایەنئەربەکانەوە سەرۆکی (حیزبی رەفا)، ئەوروپا نیگەرانیخۆی پیشان دا، لەبەر ئەوەی دروشمەکانی ئەربەکان لەکاتی هەڵبژاردندا زۆربەی لەدژی رۆژئاوا بوو، وە ناوەرۆکی دروشم و داخوازییەکان بریتی بوون لە پێك هێنانی نەتەوەیەکی یەککگرتووی ئیسلامی وەیەکێتی گومرگی ئیسلامی، رێکەوتنێکی سەربازی ئیسلامی، دوای هاتنە سەرکار لە حکومەتە نوێکەیدا لەیەکەم ووتاریدا رایگەیاند کە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا بەهێزتر دەکات بەتایبەتی لەگەڵ ئێران و سوریا، چاوێکیش دەخشێنێتەوەبە رێکەوتنە سەربازییەکەی نێوان تورکیاو اسرائیل دا، دەبێت گەمارۆی ئابووری لەسەر عێراق لابرێ، وەچەکوشی ئامادەکە (ئەمریکا -بەریتانیا - فەرەنسا) پێکیان هێناوە پێویستە هەلگیرێت ئەمانە هێزێکی صەلیبین ئامانجیان دابەش کردنی عێراقەو دروست بوونی دەوڵەتێکی کوردییە، وەزیان دەگەیەنێت بەبەرژەوەندییەکانی تورکیا...

ناوەرۆکی بەرنامەی حکومەتە ئیئتلافیەکەی ئەربەکان و تشیلر بەم جۆرە بوو: پاش ساڵێك حوکم کردن لەنێوان هەردوولادا گەرهاتوو حوکم کردنە کەسەلبی بوو ئەوا دەبێت ئەربەکان واز لەسەرۆکایەتی بهێنێو بەجێی بهێڵێ بۆ تشیلر داوای هەڵبژاردنێکی تازە بکرێت... وەزیری دەرەوەی پێشوو (مومتاز سویسال) ئاماژەی بۆ ئەم مەسەلەیە کردو رای گەیاند: ئیسلامی سیاسی بۆتە گرفتێکی ناوخۆی ئەوروپا، بەتەنها تورکیا وولاتێکی ئیسلامیە وەك ئەندامێك لەناو یەکێتی ئەوروپیدا، جگە لەوەی کە پەیوەندیەکانی تورکیا بە ئەوروپاوە لە پەیوەندی وولاتە ئیسلامیەکانی تر بەهێزترە، ژمارەی ئەو تورکە کۆچ کردوانەی لە ئەڵمانیادان ملیۆنێك کەسن، بۆیە هەچ کاتێك ئەربەکان بیروبۆچونە ئیسلامیەکەی خۆی توندتر بکاتەوە ئەوروپاش زیاتر نیگەران دەبێت. بەلام ئەمەریکا

هەڵوێستێکی جیاوازتری هەبوو پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئەوروپا بوون هەر وەك (مادلین ئولبرایت) وەزیری دەرەو نوێنەری ئەمەرکیا ئەو کاتەی دانیشتەکانی لەگەڵ ئەریەکاندا ئەنجام دابوو ڕایگەیاند سەرۆکی وەزیران بەشێوەیەکی دیموکراتیو دەستووری هەڵبژێردراوە وەئولبرایت ئاشکرای کرد ئەو نامەیەی لەلایەن ئەمەریکاوە ڕوویەرووی کراوەتەوە ئەربەکان لێی تێگەیشتووە دەقی نامەکەشی بریتی بووە لەبەردەوام بوون لەسەر دیموکراتیەت و گرنگی دان بەلایەنی ئابووریو بازرگانیو پەیوەندیە دەوڵەتیەکان و پەیمانی ناتۆو بنەماکانی عیلمانیەت و ئیسرائیل و مەسەلەی عێراق...

# تێڕوانینەکانی ئەمریکا لەسەر ئەربەکان...!!

(پەیمانگای واشنتۆن بۆ سیاسەتی ڕۆژهەلات) دامەزراوێکی ستراتیجی سیاسیە، پاش لێکۆڵینەوەو خۆئامادەکردن لە ڕاپۆرتێکی گرنگ دا تێڕوانینەکانی ئەمەریکای سەبارەت بەئەریەکان وحکومەتەکەی بڵاوکردەوە کەبەم شێوەیە بوو.

*وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بەپشت بەستن بەسیاسەتەکانی خۆی ڕێگای داوە بەهاتنە سەر حوکمی (حیزبی ڕەفای ئیسلامی) بەلەبەر چاوگرتنی ئیسلام وەك جوڵاندنەوەیەکی سیاسیو رووشنبیریەکی ئایینی، بەلام دژی کارە تیرۆریستیو توندو تیژییەکان دەوەستێتەوە کەلە پێناو جێبەجێکردنی سیاسەتەکانیان پێی هەڵدەستن.

*علمانیەت مەرجێکی سەرەکی ئەمەریکا نیە بۆ بەردەوام بوونی پەیوەندییەکانی هەردوولا ڕۆژێك لەڕۆژان مەرجی عیلمانیەت نەبۆتە یەکێك لەبەندەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا وە هیچ سیستەمێکی نا عیلمانی تر زیانی نیە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەمەریکی.

*خیتابە سیاسیەکانی ئەربەکانی سەرۆك وەزیر بریتین لەووشە ئیسلامیەکان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چەندین ووشەی نیشتمانی و نەتەوەیی تێدایە هەرچەندە ئەمەش پێشینەیەکی ئایدۆلۆجی هەیە بەڵام جۆرێکە لەشێوازی تاکتیکیو پراگماتیکی، لە پێناو شاردنەوەی تەرتیباتە ئیسلامیەکان و جیاکردنەوەیان لەدامەزراوە سەربازییە عیلمانیەکان، تەنها کات و ساتەکانی داهاتوو بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە ئایا ئەربەکان دەبێتە ئیسلامێکی دیموکراتی یان نا؟!

*ڕاگەیاندنەکانی ئەربەکان پێچەوانەی یەکترن لەهەندێ شوێندا تەم و مژێکی پێوەدیارە بۆ نموونە: ئەربەکان دەڵێت حکومەتەکەمان پابەندی هەموو ئەو ڕێکەوتنامانەن کە پێش خۆمان ئیمزا کراوە کەچی لەلایەکی ترەوە دەڵێت ئێمە خاڵەکانی ئەو ڕێکەوتنامانە جێبەجێ ناکەین کەزیان دەگەیەنن بەئاسایشی نەتەوەییو نیشتمانیەکان.

*هێشتا دەرگاکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەبەردەم ئەربەکاندا نەکراوەتەوە، وەنابێت سازش لەگەڵ سووریا بکات و چوکیبۆدا بدات وە هەچ کاتێکیش لە ئێران نزیك بۆوە ئەوا ئێران دەبێتە مونافسی ئەنقەرە بەتایبەتی لە ئاسیای ناوەڕاست، وە بەهۆی بالادەستی ئەمەریکاوە لەوانەیە ئەربەکانیش ناچار بێت لەعێراق نزیك بێتەوە.

*لەهەندێ حاڵەتدا سوپا خەتێکی سوور دیاری دەکا ئەربەکان خۆی ناتوانێ ئەو خەتە سوورە بکێشێ ئەو گۆڕانکارییە ناوخۆ کۆمەڵایەتیانەی لەتورکیا ڕوودەدەن کاریگەرییەکی خراپیان دەبێت لەسەر سیاسەتی دەرەوەی تورکی، دامەزراوە سەربازییەکان ئەم کاروبارانە بەڕێوە دەبەن بەو ڕێگایانەی خۆیان دەیزانن.

لەکاتی دەست بەکاربوونی ئەربەکانەوە تا ڕۆژی وازهێنانی لە حوکم ۱۹۹۷ ڕووبەڕووی چەند قەیرانێکی ناوخۆ بۆوە لەسەر ئاستی ئابووریو کێشمەکێشی حیزبە سیاسیەکانی تر پاشەکشەیەکی زۆری کرد لەو خیتابە سیاسیەی

پەیڕەوەی دەكردو لەو دروشمانەی لەساتەكانی هەڵبژاردندا بەرزی كربۆوە سەرەڕای ئەو بنكە جەماوەریەی كەهەیبوو.
لەماوەكانی حوكم كردنیا ئەربەكان بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی عیلمانیەتی ڕۆژئاوا وێرای ئەو پەیمان و بەڵێنەی كەبەخەڵكی دەدا لەسەر پێكهێنانی نەتەوەیەكی ئیسلامی كەچی دەستە پاچە بوو لە هەڵوەشاندنەوەی ڕێكەوتنە سەربازیەكەی توركیاو اسرائیل و چاوخشاندنەوە بەیەكێتیە گومرگیەكان.
ئەربەكان ماوەی پێنج ساڵ لەناو پەرلەماندا بەرهەڵستی ماوەی درێژ بوونەوەی چەكوشی ئامادەی دەكرد كەچی كاتێك دەسەڵاتی گرتە دەست ماوەكەی درێژ كردەوەو ڕێكەوتنێكی تازەتری لەگەڵ اسرائیل دا مۆركرد ئەمانە پێچەوانەی خواستەكانی پێشووی بوون جگە لەوەی كە بەنیاز بوو جۆرە دراوێك دەركات بەناوی(دیناری ئیسلامی)و دانانی بانكێكی مەركەزی ئیسلامی كەچی ئەم هیواو ئاواتەی هەڵوەری‌و نەهاتەدی.
ئەو پەیمان و بەڵێنانەی كەدابووی لەو ساتانەی كەخۆی لەبەرەی ئۆپۆزیسیون دابوو بەتەواوی پێچەوانەی ئەو سیاسەتە بوو كەلەكاتی حوكم كردندا پەیڕەویی دەكرد.
ئایا ئەوە چۆن لێك دەدرێتەوە...؟!
ئەندامە پێشكەوتووەكانی ناوحیزبی ڕەفا بۆیان ڕوون كردمەوە سێ لێكدانەوەیان هەبوو بۆ ئەم حاڵەتە، ووتیان:—
*كاتێك حیزبمان دەسەڵاتی گرتە دەست هیچ ئامادەیی‌یەكی پێش وەختمان نەبوو بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات كەسمان لەو باوەڕەدا نەبووین بەو خێراییە بگەینە دەسەڵات، پێشبینیەكانی ئێمە زۆر دوور بوون، خۆشمان بەتەنها نەمان ئەتوانی ئەم لێپرسراوێتیە بگرینە ئەستۆ و لەگەڵ هیچ حیزبێكی تردا بەشداریمان نەبوو.

ئەم لێکدانەوەیەش بەواتای خۆیان دیارە بەتەنها وویستویانە حوکم بگرنە دەست لەپاشان ناچار بوون کە رێکەوتن لەگەڵ حیزبێکی تردا فەرز بکرێت بەسەریاندا...

*لێکدانەوەی دووەم: پێیان وابوو وولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاو دامەزراوە سەربازیەکان لەسەرەتاوە هێڵێکی سووریان بۆ ئەربەکان دەست نیشان کردبوو تاکو توانای ڕووبەڕوونەوەی سوپاو ئەمەریکای نەبێت کەواتە مانای وایە گەمەسیاسیەکان لەدەست خۆیاندا نەمابوو.

*لێکدانەوەی سێهەم: سیاسەتی ئەربەکان زیاتر سوور بوو لەسەر لایەنە ئابووری‌یەکان و وەزعی ناوخۆ، وە لەم ڕووانگەیەوە بڕیارێکی دەرکرد بەزیادکردنی مووچەی کرێکاران بەڕێژەی ٥٠٪ و لەگەڵ تشیلردا ڕێکەوت لەسەر سیاسەتێك بۆ هێنانە خوارەوەی هەڵئاوسان و چاککردنی هاوسەنگی دەوڵەت نەهێڵێت نرخی لیرەی تورکی لەوە زیاتر بێتە خوارەوە، کەنرخی دۆلارێك بریتی بوو لە ٨٣ هەزار لیرەی تورکی، وە دیاردەی بێکاریش کەم کاتەوە کە تێکڕای ڕێژەی بێکاران گەیشتبووە (١٧٪).

# هاوکاری سەربازی تورکیا - ئیسرائیل و کێشەی نێوان سوپاو ئیسلامیی سیاسی

لەچاو پێکەوتنێکدا لەگەڵ (سیفی تشان) سەرۆکی پەیمانگای سیاسەتەکانی دەرەوە ڕایگەیاند کە: سیاسەتی دەرەوەی تورکیا کەوتۆتە ژێر کاریگەری فاکتەری جوگرافیاو لایەنی ئابووری‌و مێژوویی‌و بارودۆخە کۆمەلایەتی‌و سیاسی‌یەکان و وەزعی دەولی، بارە جوگرافیەکەی کەوتۆتە نێوان ئەورووپاو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە لەیەکێتی سۆڤیەتی جارانەوە درێژ دەبێتەوە

لەسەر هەردوو دەریـای ڕەش و ناوەڕاسـت، لەبـەر ئـەم هۆیانـە لـەکاتی جـەنگی ساردا گرنگیەکی تایبەتی هـەبوو بـۆ ئـەوڕپاو ئەمـەریکا وەلـەباری مێژوویی‌یـەوە لەدوای هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە ژمارەیەکی زۆر لەتورکەکان بە وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست و بەلقان و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا بڵاوبوونـەوەو وە مانەوەیان لەم شوێنانەدا بوو بووە هۆی دروست کردنی خزمایەتی لەگەڵ کۆمارە ئیسلامی‌یەکان و وڵاتەکانی ناوەڕاستی ئاسیا ئەمـەش هـاو سۆزییەکی دروست کردووە لەگەڵ ئەم وڵاتانە، وە دوژمنایەتیشی هەیە لەگـەڵ یۆنـان و ئـەرمینیا و هـەندێ وڵاتـانی عـەرەبی. تورکیـاو ئیسـرائیل دوو وڵاتـن کـە خەسـڵەتێکی جیاوازیـان هەیـە کەوتونەتـە سـەر سنوری وڵاتــە عەرەبی‌یـەکان کـەچی وەك سیاسـەت و ڕۆشـنبیری وابەسـتەن بـە ئەمـەریکاو ئـەوروپاوە، لەلایـەکی تــرەوە تورکیـا وەك ئیسـرائیل چـوار دەوری دراوە بەچـەند دراوسـێ‌یەکەی دوژمـن وەك ڕوسـیاو ئـەرمینیاو ئـێران و سـوریاو عـێراق و یۆنـان و بولگاریــا، ئـەم زەمینـە هاوبەشە هەردوکیان بەیەکەوە گرێدەداو بارو دۆخێکی گونجاوی دروست کردووە تا هەردوو لەیەك نزیك ببنەوە..

پاش هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و کۆتایی جـەنگی ساردو دۆڕاندنـی عـێراق لەجـەنگی کـەنداو، گرنگـی سـتراتیجی تورکیـا بـۆ ئەمـەریکاو نـاتۆ کـەم بـۆوە، ئەوروپاش ڕێگرە لەچوونە ناوەوەی تورکیا بۆ ناو یەکێتی ئەوروپی نەك بەتەنـها لەبـەر زۆربوونـی ژمـارەی دانیشـتوان و زیـادبوونی بێکـاری‌و هاتنــە خــوارەوەی داهـاتی تاکـە کەسـی تورکـی بـەڵکو بـەهۆی کێشـەی قوبــرس و پشــت بەســتن بەتواناکانی خۆی‌و سەرباری ئەوەی کە تورکیا تەنها وڵاتێکی ئیسلامی‌یە هـەوڵ ئەدات بۆ چوونە ناوەوەی یەکێتی ئەوروپا، بە حوکمـی ئـەو پێگەیـەی تورکیـای تێدایـە دەیـەوێت بــەدوولادا خــۆی بجوڵێنــێ لەلایەکــەوە بــەرەو دراوســێکانی باشـووری وەك ئـەرمینیاو ئازربینجـان و بلغاریـاو جورجیـاو یۆنـان و مولودوفیـاو ڕومانیا و ڕوسیا بۆ ڕێکخستن و هاوکاریەکی ئابووری لەسەر دەریـای ڕەش بـەڵام لەم حاڵەتەدا خاڵێکی لاوازی تیا دەبینرێ چونکە لەم ناوچانەدا توشی نـەبوون و

کەمی سـەرمایەی پێویست دەبێتـەوە بۆ هەڵسوڕانی ئـەم کـارە هـەروەها ئـەم ناوچانە کێشەو ململانێتی‌ی سیاسی‌و سەربازی تیا دەبینرێ.
جوڵانـەوەی دووەم لـەدوای ساڵی (١٩٩٠)وە بـوو بەتەنیشـت دەریـای ڕەشـەوە بەرەو چوار کۆمارە تورکیەکـەی ناوەڕاستی ئاسیا (ئازربیجـان و کازاخستان و تورکمانستان و ئوزبەکستان)، بیروڕای تۆرگـوت ئۆزال وابـوو کـە هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و دۆڕاندنی عێراق لەجەنگی کەنداو هەلێکی لەبارە کە ئەو چوار کۆمارە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە لەژێر کاریگەری ئیمبراتۆریەتی ڕووسی دەریان کێشێتە دەرەوە ئەمەشیان تەنها لەچوار چێوەیەکی تیوریدا مایـەوەو نـەچووە قـاڵبێکی عەمەلیـەوە ئـەم هەوڵـەش بـەهۆی مردنـی ئۆزالـەوە پوکایـەوە. جگـە لەمانەش دەیەوێت بەرەو ئیسرائیل خـۆی کێش بکات، سیاسـەتمەدارانی تـورك ساڵی ١٩٩٥ لەوباوەڕەدا بوون کـە ئاشـتیەك لـەنێوان سـوریاو ئیسـرائیل دا مـۆر دەکـرێ ئەمـەش مانـای بـەهێزبوونی سـوریایە لەبەرامبـەر تورکیـا یـاخود لـەوە دەترسان گەر سووریا کێشەکانی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل کۆتایی پـێ بێنێت ئـەوا لەوانەیە بێتە وێزەی تورکیاو گێچەڵی پێبکات و ببنە هـۆی بـەهێز کردنـی پـارتی کرێکـارانی کوردسـتان (P.K.K) و هانیـان بـدەن بـۆ جیابوونـەوەو دامـەزراندنی دەوڵـەتێکی کـوردی، ئەنقـەرە دەترسـا ڕێکـەوتنێکی لـەم جـۆرە بێتـە کایـەوەو بەهۆی ئەمەشەوە بۆ بەدەست هێنانی ئاو کـە ئیسـرائیل لەسوریای وەرگرێـت و مەترسـی بخرێتـە سـەر پـرۆژەی (GAP)، بـۆ بەدەسـت هێنـانی ئـاوی پێویسـت لەلایەن ئیسرائیلەوە ناڕەزایی لەلایەن دەوڵەتە عەرەبیەکانـەوە بـەرز بێتـەوە بـۆ سەر ئەم پرۆژەیە.
گرفتـی ئـاو دەکرێـت لـەچوار چێوەیـەکی ئاشـتی یـا هاریکارییـەکی ئیقلیمـی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت چارەسـەربکرێت بـەڵام کێشـەی (P.K.K) لـەلای تورکیـا لەکێشەی ئاو گرنگترە بەبێ چارەسـەر سـەیری دەکـات، وەك (ممتـاز سویسـال) وەزیری دەرەوەی پێشـوو دەڵـێ ئێمـە لەگـەڵ هـەردوو وڵاتـی سـوریاو عـێراقدا

پێشنیاری كێشـەی ئاومـان كـردووە دەتوانـین چارەسـەری بـۆ بدۆزینـەوە بـەڵام كێشەی (P.K.K) لەكێشەی ئاو گەورەترە...!!
بۆ بەرەو پێش چوونی پەیوەندیی‌یەكانی لەگەڵ ئیسرائیل دا توركیا هەوڵی ئـەدا لەچوار چێوەیەكی دەولیـەوە سـوود وەرگرێـت سـاڵی ١٩٩٠ توركیـا پرۆژەیـەكی خستە بـەردەم ئیسـرائیل بـۆ فرۆشـتنی ئـاوی خـواردن بەدەوڵەتـە عەرەبیـەكان بەهۆی كۆمپانیایەكی توركی‌یەوە لە قوبرس. وە لەكاتی دەستپێكردنی پرۆسەی ئاشـتی عـەرەب - ئیسـرائیل سـاڵی ١٩٩١ لەمـەدرید ئیـتر توركیـا پێویسـتی بـە شاردنەوەی پەیوەندیی‌یـەكانی نـەبوو لەگـەڵ ئیسـرائیل وە داواشـی لـە عـەرەب دەكرد بۆدان پیانان بە حەقیقەتی ئیسرائیل دا.

## ئایا توركیا بەدوای چی‌دا دەگەڕێت؟

بەپلەی یەكەم توركیا دەیەوێت كۆمـەك و یارمـەتی سـتراتیجی لەلایـەن ئیسـرائیلەوە بـۆ خـۆی بەدەسـت بێنـێ لەبـەرەكانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتداو ڕووبەڕووبونەوەی كێشەكانی‌و وەك كێشەی ئاوو سنوورو نەهێشتنی توندو تیژی‌و ئاژاوەكاری. وە لەبارەی ئەو ڕێكەوتنە سەربازیانەی توركیاو ئیسرائیل، دەبوایـە ئیسـرائیل پاڵپشـتی توركیـا بكـات وەك یارمـەتی تەكنـەلۆجی‌و ئـەلكترۆنی، وەمـانۆری هاوبـەش لـەنێوان هـەردوولا، بەگەڕخستنەوەی فرۆكـە جەنگیـەكانی توركیا، گۆڕینەوەی زانیاریی‌یەكانی هەواڵگیری‌و پـەرەپێدانی پیشەسـازی‌یەكانی توركیا...، وە ئەنقەرەش هەوڵی ئەدا بۆ پرۆژەی فرۆشتنی (٢٠) ملیـۆن تـەن ئـاو بەیارمەتی ئیسرائیل لە باشووری قوبرسەوە ڕەوانەی دەرەوە بكات.
وەزیری دەرەوەی پێشوو (سوسیال) دەڵێت: ئیسرائیل و توركیا پەیوەندی‌یەكی باش و ڕاستەوخۆیان هەیە لەبواری بازرگانی‌و وەبەرهێنانەكان - استثمار، وبوارە گەشت وگوزارییەكان.

وەئێستا (٤٣) کۆمپانیای وەبەرهێنانی ئیسرائیلی بوارە جۆراو جۆرەکان لەناو توركيان تەنانەت حکومەتە ئیئتلافیەکەی ڕەفاو ڕێگای ڕاستیش نەیان توانی چاویان بنوقێنن لەئاست سەرمایەکانی ئیسرائیل دا، هەموو حیزبە سیاسیەکانی توركيا پێشبڕکێیان بوو بۆ بەدەست هێنانی سەرمایەی تورکی، حیزبی ڕەفا دەیووت توركيا پەیوەندیی‌یەکانی خۆی لەگەڵ ئیسرائیل دا درێژە پێدەدات بەبێ گوێدانە بیروبۆچونە عەقائیدی‌یەکانمان چونکە لایەنە ئابوری‌یەکان فراوانتر بوون و بەرژەوەندیی‌یەکانی توركيا ڕەچاو دەکەین هەتا کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ (٨٠٠) هەزار ئیسرائیل سەردانی توركيايان کردووە. بێجگە لەمەش توركيا هەوڵی زیاتری دەدا بۆ بەگەڕخستنی چەند پڕۆژەیەکی سیاحی هاوبەش. وە ئیسرائیلیش داوای یارمەتی لە توركيا دەکرد بۆ پشتگیری کردنی (لۆبی یەهودی - جماعة ضاغطة )تاکو ببنە کارتێکی سیاسی لەسەر توركيا، ئەوەی جێگای باسە نزیکەی (٢٤) هەزار یەهودی لەتورکیایە، وە لە ئیسرائیلیشدا (١٢٠) هەزار تورکی یەهودی هەیە.

توركيا دەرگای ڕێکەوتنەکانی والآ کردبوو بۆ بوارەکانی ترنیش سەرۆك وەزیرانی پێشوی ئیسرائیل دەریخست کە پێشنیارێکی (ئەردەنی)مان بەدەستەوەیە بۆ مۆرکردنی ڕێکەوتنامەیەك لەنێوان توركياو ئیسرائیل و ئەردەن و عێراقی دوای (سەدام حسێن) لە پێناو ڕووبەڕووبونەوەی هەر مەترسیەکی چاوەڕوان نەکراو..

ئەو ئەندامانەی حیزبی ڕەفا کەمن دیدارم لەگەڵدا کردوون بۆیان ڕوونکردومەتەوە کەئەم ڕێکەوتنە لەسەرو خواستی وولاتە یەککرتووەکان کراوەو لەبەر خاتری بەرژەوەندی ئیسرائیل، ئەو سەرچاوانە ڕوونیان کردەوە کەدامەزراوە سەربازیی‌یەکانی توركيا لەپشتی پەردەوە زۆر بەووریایی لەهەموو ڕێکەوتنەکان ئاگادارن بەتایبەتی ئەو ڕێکەوتنانەی لەسەر تاقیکردنەوە ئەتۆمیەکان دەکرێت بەهاوبەشی لەگەڵ ئیسرائیل دا وە لەخوارووی ڕۆژهەلاتی توركيا ئەنجام ئەدران، وە دێهاتەکانی ئەم ناوچانەیان بەتەواوەتی چۆڵ کرد بەبیانووی چالاکیەکانی (P.K.K) وە تا بیکەنە گۆڕەپانێك بۆ تاقیکردنەوە هاوبەشەکانی هەردوو وولات.

لەمیانەی ئەم ڕێكەوتنانەدا كۆمپانیای ئیسرائیلی (ئیرۆسبیس ئەندسترین) كورت كراوەكەی (I.A.I)ە ڕێكەوتنامەیەكی مۆركرد بەخستنەوەگەڕی (٥٤) فڕۆكەی جەنگی لەجۆری (آف ٤) وە پڕچەككردن و پێشخستنی بەچەند دەزگاو پارچەی ئەلەكترۆنی وەنرخی تێچوونەكەی (٦٠٠) ملیۆن دۆلار بوو لەشێوەی قەرزدا وە لە قۆناغی یەكەمدا (٢٦) فڕۆكەی دایەوە بە توركیا بەیاوەری چەند ئەندازیارێك و چەند كەسێكی هونەری بۆ فێربوون و ڕاهێنانی توركەكان، وە لەپاڵ ئەم ڕێكەوتنانەشدا هەر لەو ماوەیەدا چوار ڕێكەوتنامەی ئابووری و بازرگانی لەنێوان هەردوولا مۆركرا.

لەسۆنگەی هەموو ئەم ڕێكەوتنانەی توركیاو ئیسرائیل بەشێوەیەكی گشتی هەریەك لەباڵە جیاجیاكانی ناو حكومەتی توركی ڕای خۆیان بەم شێوەیە ڕوون كردەوە:-

نوێنەری باڵی ڕاست: پێویستە توركیا بەرژەوەندیەكانی خۆی هەمیشە بۆ ئێستاو بۆ دوارۆژیش لەبەرچاو بگرێت.

نوێنەری باڵی چەپ دەیووت: پەیوەندیە ئابووریەكانی توركیا لەگەڵ ئیسرائیل دەبێت لەسەر حسابی پەیوەندی دەوڵەتە عەرەبیەكان نەبێت.

نوێنەری حیزبی ڕەفاش دەیووت: بەهۆی بەرفراوان بوون و گەورەتر بوونی پەیوەندی‌یە ئابووری‌یەكان، توركیا دەتوانێت پەیوەندی لەگەڵ هەر دەوڵەتێكدا ببەستێت گەر لەبەرژەوەندی خۆیدا بێت بەمەرجێك پەیوەندی‌یەكان زیانیان بۆ سەر بیروڕاكانی ئیسلام نەبێت.

# ڕەفا ... و هاریکاری تورکی ئیسرائیلی.

چۆکـدادان و سازشـکاریيەکانی ئەربـەکان بـۆ سـوپا ببـووە هـۆی شـاردنەوەی پەیوەندییـەکانی تورکیـا – ئیسـرائیل، وەزیـری بـەرگری تورکیـا (تورهان تایان) ئاشکرای کرد کە مەشقە سەربازییەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیل لەلایـەن ئەربـەکان و حیزبەکەیـەوە پاڵپشـتی لێدەکرێـت و هـەروەها ڕۆژنامـەی (میلیات)ی تورکـی بـڵاوی کـردەوە پیـاوانی حـیزبی ڕەفـا تەنـها بوونەتـە بینـەر لەهاریکارییە سەربازییەکانی تورکیاو ئیسـرائیل، سیاسـەتەکانی ئەمـەریکا خـۆی داڕێـژەری ئـەم نەخشـانەیە بـێ گوێدانـە حکومـەتی تورکـی، وە لایـەکی تـرەوە (عبـدالله گـول) جێگـری حـیزبی ڕەفـا ئـەم قسـانە بـەدرۆ دەخاتـەوە دەڵێـت لـە کۆبوونـەوەکانداو بـۆ بڕیـاردان لەسـەر ئـەم ڕێکەوتنانـە ئەربـەکان خـۆی لەگـەڵ سەرۆکی ئەرکان (جەنەڕاڵ ئیسـماعیل حـەقی)دا، دادەنیشـت و بڕیاریـان لەسـەر دەدا.

یەکێك لەڕێکەوتنامەکان کۆبوونەوەی مانگی (٤)ی ساڵی ١٩٩٧ بـوو لـە ئەنقـەرە لەنێوان تورکیاو ئیسرائیل وە ناوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتنەش خۆ ئامادەکردن بوو بـۆ سەر ئـەو مەترسـیانەی لـەداهاتوودا ڕەنگـە دوچاریـان بێتـەوە لەلایـەن وڵاتـانی (ئێران و سوریا) وە بۆیە ناویان لێنا ڕێکەوتنی (پێشبینی مەترسیەکان).

ئەم ڕێکەوتنەش بەبێ ئاگاداری سەرۆکی حکومـەت (ئەربـەکان) بـوو هەرچـەندە کەخۆی پێشوازی لەوەزیری دەرەوەی ئیسرائیلی کرد، وە کـاتێکیش ئەربـەکان کەوتە گفت و گۆ لەگەڵ وەزیری دەرەوەی ئیسرائیلی باسی لەجۆری ڕێکەوتنەکە نەکرد بەڵکو باسـی لـەگرنگی شـاری (قـودس) بۆ کـرد کـە پایتـەختێکی گرنگـی ئیسلامەکانە، کەچی وەزیری دەرەوە بەرپەرچی دایەوەو پێی ڕاگـەیاند هـەرگیز قودس نابێتە پایتەختی هیچ دەوڵەتێك وتەنها پایتەختی دەوڵەتی ئیسرائیلە.

ئەربەکان بەشێوەیەکی جیاوازو جۆراو جۆر مامەڵەی لەتەك (هاوسەنگی هێزەکان)دا ئەکرد:

لەناوەوە: تەرازووی هێزی سیاسەتی تورکی داشکاند بەلای فەرمانڕەوا سەربازییەکاندا.

لەچوارچێوە ئیقلیمیەکاندا: ئیسرائیلی وەك هێزێکی دەسەڵاتدار پێشان دا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لەجیهاندا: سەلماندی ئەمەریکا تاك جەمسەرە لەسیستەمی دەولیدا.

ئەربەکان باوەڕێکی چەسپاوی بەپرنسیبەکانی خۆی نەبوو بەڵکو باوەڕێکی لەرزۆك و ناجێگیری هەبوو بۆ نموونە لەڕووداوەکەی مانگی شوباتی ساڵی١٩٩٧ سەرۆکی شارەوانی لەئەنقەرە کۆبونەوەیەکی میللی بەدانیشتوان کرد بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بەسیاسەتەکانی ئیسرائیل لە قودس، وە لەئاکامدا سوپا ئابلۆقەی دان سەرۆکی شارەوانی گیراو خرایە زیندانەوە کەچی ئەربەکان بێدەنگ بوو لەئاست ئەم سوکایەتی پێکردنەو نەیتوانی هەڵوێست بگرێتە بەر ئەترسا لەوەی لەگەڵ سوپادا تێك هەڵچێت.

بۆ خۆ دەرخستن وخۆ نیشاندان وەك (مجاهدێك) لەبەردەم دۆست و مورید ەکانیو ئەندامانی ناو حیزبەکەیو هاوسۆزانی لەدەوڵەتە ئیسلامیەکانی دراوسێ، ئەربەکان چەند گەشتێکی کرد بۆ دەوڵەتە ئیسلامیەکان وەك ئێران و لیبیا وە هەر زوو سوپاو پیاوە سەربازییەکان لێ ی هاتنە وەلام و کەوتنە بەر ڕەخنەی ئەوان، یا کاتێك ڕێکەوتنە سەربازییەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیل بەبێ ئاگاداری ئەربەکان دەکران کەچی ئەم پاساوای بۆ دەهێنانەوە یاخوود لەناچاریا بێدەنگ دەبوو.

وە ئیسرائیلیش لای خۆیەوە پەلەی دەکردو بەگوڕو تینێکی خێراوە ڕێکەوتنەکانی ئەنجام ئەداو پروپاگەندەی بۆ دەکرد تاکو ئەربەکان شەرمەزار کات و جوڵەی لێببڕێ لەبەردەم بنکە حیزبیەکەیدا.

بەپێی سەرچاوەکان و ئەو زانیاریانەی دەستکەوتوون ئیسرائیل (٢٤) ڕێکەوتننامەی سەربازی لەگەڵ تورکیا ئیمزا کردووە گرنگترینیان ئەمانەن:-
*پرۆژەی بەگەڕخستنەوەو نوێ کردنەوەی فرۆکەی اف ٤.
*پرۆژەی بەگەڕخستنەوەو نوێ کردنەوەی فرۆکەی اف ٥.
*دروست کردنی فرۆکە بۆ مەشق بەبێ فرۆکەوان، بە فرۆکەوانەوە بۆمەبەستی چاودێری.
*پرۆژەی هاوبەشی (ئیسرائیل و ئەمەریکا) بۆ پەرەپێدانی مووشەك لەدژی مووشەکی (پاتریۆت).
*پێش خستنی تانکی (ام٦٠)، وە کرینی ٦٠٠ تانك لەجۆری (مێرکۆری).
*گۆڕینی تفەنگی سوپای تورك بە گۆڕینی تفەنگی ئیسرائیلی (رایفال).
*بەخشینی ئامێری ئەلکترۆنی تایبەت بەچاودێری کردنی سنوور، بەتورکیا.
*هەڵسەنگاندنی بارودۆخ و پلەی مەترسیەکان هەر بە (٣)مانگ جارێك لەسەر ئاستی پیاوانی شارەزاو هونەرییەکانی ناو وەزارەتی بەرگری.
*گۆڕینەوەی زانیاریە هەواڵگیرییەکان - الاستخباریە بەشێوەی (کۆد)ی نهێنی.
*دروست کردنی فرۆکەی اف١٦ بەهاوبەشی هەردوولا.
لەگەڵ ئەوەی کە حیزبی ڕەفای ئیسلامی لەسەر حوکم بوو، وە نەجمەدین ئەربەکان لە سەرۆکایەتی‌دا بوو زۆربەی ڕێکەوتنە سەربازییەکانی تورکیاو ئیسرائیل لەو کاتانەدا مۆرکران.
کادێرو هەڵسوڕاوەکانی حیزبی ڕەفاش پاساوی خۆیان هەبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەم کارانە بەم شێوەیە بەرگریان لەخۆیان دەکرد، (عبدالله گۆل) جێگری سەرۆکی ڕەفا کە وەزیری دەوڵەت بوو ئەیووت:
ڕێکەوتنەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیل پێش هاتنە سەر حوکمی ڕەفا بوو، وە یا دەڵێ ئێمە بەتەنیا حکومەتمان پێك نەهێناوە حکومەتیش بەتەنها بریتی نیە لە حیزبی ڕەفا، حکومەتەکەمان حکومەتێکی ئیئتلافیە بۆیە ئەم سازشانەمان کردووە. وە هەر لە میانەی ئەم بەرگریکردنەیدا دەڵێت ئەم ڕێکەوتنانەی لەم

جۆرەن بریتین لەبەرژەوەندی، وە بەمانای ئیسلامی یەکەی (پێویستییە)، تورکیا پیلانی خۆی هەیە بۆ نوێکردنەوەی هێزە چەکدارەکانی، مافی تەواوی خۆیەتی وە پێویست بوو لەم بوارەدا ئەمەریکا هاوکاریو دەستپێشخەری خۆی بکردایە بۆ تورکیا بەلام ئەمەریکا بڕیاری نەدا بۆیە تورکیا ئیسرائیلی هەلبژارد بۆ هاوکاریکردن لە پرۆسە سەربازیەکاندا.

وە ئەربەکان ڕاستی دەکرد لەو ڕوونکردنەوانەدا چونکە نوخبە سەربازییە عیلمانیەکان دووربین تر بوون هەستیان بەچەند مەترسیەکی چاوەڕوان کراو دەکردو ئەو مەترسیانەش:-

١-مەترسی ئوسولی ئیسلامی لەناوەوە (ڕەفا)، لەدەوروبەرە ئیقلیمیەکەشدا دەولەتی (ئێران).

٢-بەهۆی چالاکیەکانی (P.K.K) وە ترسیان هەبوو مەودایەکی ئیقلیمی بەخۆیەوە بگرێت و درێژ بێتەوە بۆ ناو سوریاو بنکەو بارەگا لەوێ دابنێت.

٣-کەنار گیربوون و دابڕانی تورکیا لە سیستەمی ئاسایشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست گەربێتوو بەرنامەکانی ئەمەریکا سەربگرێت بەچارەسەرکردنی کێشەی عەرەب - ئیسرائیل و ڕێکخستنەوەی وەزعی عێراق.

پێشبینی دامەزراوە سەربازییەکانی تورکیا هەر بۆ ئێستا و کاتێکی دیاریکراو نەبوو بەلکو پیلان و بەرنامەیەکی دوور خایەنیان هەبوو بۆ سالی (٢٠٢٠)، بەپێی زانیارییەکانی (مەلبەندی ڕۆژانەی ستراتیجی ئەمەریکی SAIC ) دەریدەخا کەدامەزراوە سەربازییەکانی تورکیا ئامانجێکی ستراتیجی درێژخایەنیان هەیەو هەولئەدەن تا سالی ٢٠٢٠ تورکیا بکەنە وولاتێکی خاوەن هێزی ئەتۆمیو هەروەها تورکیا لە پەیوەندییەکی ئەوروپییەوە بازبدات بۆ پەیوەندییەکی ئەتلەنتیو بچێتە ناو کۆمەلەی پەیمانی ئەتلەنتیەوە (ناتۆ) وببێتە دیوارێکی پۆلایین بەرامبەر ڕوسیاو تارۆلی تورکیا کەم نەکاتەوەو نەیکاتە دەولەتێکی بچکۆلە، شتێکی تر وەك پەیمانەکەی (سیڤر)ی سالی ١٩٢٠ دووبارە نەبێتەوە کە تورکیا تیا زەرەرمەند بوو.

# ڕۆڵی تورکیای ئیقلیمی و سیناریۆی ئەتاتورکی

پەیوەندی‌یە ئیقلیمیەکەی تورکیا بە ئێرانی دراوسی‌یەوە هەر لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی‌و تورکیای ئێستادا ناسەقام گیر بووە وە ناکۆکی بەخۆوە دیووە بەلام هاوسەنگی هێزی نێوان ئەم دوو وولاتە نەگەیشتۆتە دژایەتیەکی سەرسەختانەی یەکترو کێشەی قووڵی بۆ دروست نەکردوون، پەیوەندیەکانی نێوان ئێران و تورکیا نەپەیوەندی‌یەکی دوژمنانەیەو نەپەیوەندی‌یەکی دۆستانەشە.

تورکیا کەوتبووە نێوان دووکایەوە، یەکێکیان بەلای ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا ئەوی تریان بەلای ڕۆژئاوا، وە خۆکێش کردنی بەرەو کایەی (ڕۆژئاوا)ی بەچاکتر زانی مەسەلەو بەرژەوەندییەکانی ناو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست مایەی سەر ئێشەو گێچەڵ بوو بۆ ئەنقەرە پێچەوانەی ئەمە وایان لێکدەدایەوە پەیوەندی کردنی بە ئەورووپاوە سەنگ و قورسایی تورکیا بەهێزتر دەکات ئەمە بیروبۆچونی ئەتاتورکی‌یەکان بوو هەموو کاتێ وایان دەبینی تورکیا عیلمانیەکی ئەورووپی‌یە بەبێ هیچ دوو دڵیەك و ئەملاو ئەولایەك دەیانووت خۆمان بە ئەندامێکی (ناتۆ) دەزانین و پەیوەستین بە یەکێتی ئەورووپیەوە...

یەکێك لەمەسەلە ئیقلیمیەکان (سووریا) بوو وە تێڕوانینیان بۆ سووریا هەروەك (ممتاز سوسیال) دەیووت (پێویستە سووریا مەسەلەی لیوای ئەسکەندەرونە بیر خۆبیاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت کێشەی کوردەکان لەگەڵ کێشەی ئاوی فورات لەیەك جیابکاتەوە یارمەتی خۆی بۆپارتی کرێکارانی کوردستان بوەستێنێ سەرۆکەکەشی (عبدالله ئۆچەلان) دووربخاتەوە یا تەسلیمی کاتەوە، لەبارەی ئاوی فوراتەوە ئێمە دەزانین ناڕەزایەتیەکی عەرەبی هەیە بۆ سەر

پرۆسەی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ ئەمەش دەتوانرێ چارەسەر بكرێ لە چوار چێوەیەكی ئیقلیمیدا لەڕێگای گفت و گۆو دانیشتنی هەمەلایەنە، ئێمە دەتوانین بەشێكی زۆر كەم ئاو بدەین بە عێراق و سوریا بەپێی ڕێكەوتننامەیەكی دەولی پێشووتر بەڵام توركیا ئەم كارە ناكات ئەم بڕیارە بەرپەرچ دەداتەوە).

پەیوەندییە دوو قۆڵیەكانی توركیا لەگەڵ ئیسرائیل ئاسۆیەكی تریشی هەبوو لەلایەكەوە فشارێك بوو بۆ سەر سووریا لەلایەكی ترەوە بۆ جێبەجێكردنی سیستەمێكی هاوكاریو دابین كردنی ئاسایش بوو لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وەزیری دەرەوەی پێشوو (حیكمت چەتین) ڕایگەیاند بەهۆی ئەم ڕێكخراوانەی دروستمان كردوون لەنێوان توركیاو ئیسرائیل و مصر وچەند لایەنێكی تریش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ، دەتوانین چارەسەری كێشەكانی ئاوو مەسەلەی كوردو سەرلەنوێ دابەشكردنی داهاتە ئابوورییەكان بكەینەوە.

بەكورتی سیناریۆی ئەتاتوركیەكان هیچ جیاوازیەكیان نەبوو لە سیناریۆی ئەمەریكا كەلە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەینواند وە لاسایی كەرەوەی ئەوان بوون.

# سیناریۆی ڕەفای ئیسلامی:

ئێستاش ئەو برینە كۆنە لەناو دڵی هاووڵاتیە توركەكان ساڕێژنەبووە بیرەوەرییەكی تاڵی لادروست كردوون بەوەی كەوا دەزانن هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەهۆی خیانەتی عەرەبەكانەوە بوو.

وە نەجمەدین ئەربەكانیش چەند دروشمێكی بەرزكردبۆوە وەك پێك هێنانی (پەیمانێكی بەرگری ئیسلامی) لەوێنەی (پەیمانی ناتۆ) لەنێوان وڵاتە ئیسلامیەكانداو دانانی بانكێكی ئیسلامی دەركردنی دیناری ئیسلامی بەچاو پۆشی كردن لەو دروشمانە، ڕەفای ئیسلامی دەیویست برایەتیەك لەنێوان ئیسلامەكاندا پێك بهێنێ و كێشەكانی توركیای ناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست چارەسەر بكات ئەوەی كەئەربەكان كردی دروستكردنی حكومەتێكی ئیئتلافی

بوو لەنێوان حیزبەکەی و حیزبی ڕێگای ڕاست، لەڕێی سیاسەتەکانی دەرەوەشدا هەوڵی ئەدا سەنگ و قورسایی تورکیا لەبازنەی ئیسلامیدا زیاتر بکات، پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ دەوڵەتە ئیسلامیەکاندا پەرەپێبدا، سەردانی ئەربەکان بۆ ئێران دووەم سەردانی بوو بۆ دەرەوەی وڵات، ئەربەکان پێش دەوڵەتە عەرەبیەکان ئێرانی هەڵبژارد کەسەردانی بکات چونکە پەیوەندی تورکیا لەگەڵ ئێران بەبەراوردکردن لەگەڵ دەوڵەتە عەرەبیەکاندا پەیوەندییەکی دوژمنانە نەبوو وە تورکیا یەکێکە لەو وڵاتانەی دانی ناوە بەشۆڕشی ئیسلامی ئێران و پەیوەندیە ئابورییەکانی نێوان ئەنقەرەو تاران پەیوەندیەکی باش بوو لەکاتی جەنگی نێوان عێراق - ئێران، کێشەکانی نێوان ئەنقەرە - تاران نەچوو بوونە حاڵەتی تەقینەوە هەرچەند دوو ئایدۆلۆژیای دژبەیەکیان هەبوو، وە ئێرانیش (کارتی کوردی) بەکار نەهێناوە بیکاتە فشارێك بۆ سەر تورکیا.

سەردانەکەی ئەربەکان بۆ ئێران پاش هەفتەیەك بوو لەدوای ئەو یاسایەی ئەمەریکا دەریکرد بۆ سەر ئێران بەناوی (یاسای- داماتو) بۆ سزادانی ئەو کۆمپانیانەی کاری بازرگانی لەگەڵ ئێران دەکەن. وە ئەربەکان لەگەڵ ئەوەی لەزۆربەی دروشمەکانی کاتی هەڵبژاردنەکەی پەشیمان بوو بوەوە، ناڕازی بوو لە مۆرکردنی یەکێك لە ڕیکەوتنە سەربازییەی تورکیا - ئیسرائیل (١٩٩٥) لەبەر ئەوەی پارەیەکی ئێجگار زۆر دەچووە گیرفانی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە کە بریتی بوو لەبڕی (٢٠) ملیار دۆلار، پێی وابوو ئەو بڕە پارە زۆرە دەتوانرێ لە ڕوناك کردنەوەی دێهات و شارەکانی تورکیا سەرف بکرێت و بۆ دابین کردنی وزە بەکار بێت کە ئێستا تورکیا بەدەست کەمی وزەی کارەباوە دەناڵێنێ.

وە لەکاتی کۆنگرە پێشنیار کراوەکەی نێوان (تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا) بەرامبەر بەفشارەکانی ئەمەریکا وەستایەوەو هەڕەشەی لە (چیلەر) دەکرد بە هەڵوەشاندنەوەی حکومەتە ئیئتلافیەکەی.

# ئەتاتورکیەکان یا ئیسلامیەکان:

ئەتوانین بڵێین سەرکەوتنی حیزبی ڕەفا بۆ سەر حوکم تورکیای خستە بەردەم دوو سیناریۆی ناو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە:
١-سیناریۆی ئەتاتورکی (ئەمەریکی -ئیسرائیلی).
٢-سیناریۆی برادەرە ئیسلامیەکان.
ئەم دوو سیناریۆیە لە ململانێدا بوون، چوونە پێشەوەی سیناریۆی یەکەم بەندە بە گۆڕانکاریەکانی پرۆسەی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە سەرکەوتن یا پووکاندنەوەی ئەم پرۆسەیە کاریگەری خۆی دەبێ بۆ سیناریۆکە، ڕۆڵی ئەمەریکاو ئیسرائیل ڕۆڵی یەکەم وبەرچاویان دەبێت چ بەشێوەی فشاری سیاسی بێت چ بەشێوەی یارمەتی و کۆمەك کردن بێت.
بۆ سەرکەوتنی سیناریۆی دووم (برادەرانی ئیسلامی)، پەیوەندی هەیە بەڕۆڵی ئیسلامی سیاسی تورکیەوە واتە بەخودی خۆیان و حاڵەتە (خۆیی - ذاتی)و مەوزوعیەکانی خۆیانەوە. بەڵام سیناریۆی ئەتاتورکی بەتایبەتی لە سیاسەتەکانی دەرەوەی تورکیا کارکردی یەکەمەو ڕۆڵی کاریگەری لەڕووداوە چارەنووس سازەکاندا هەیە.
هەڵسوڕێنەرو پاسەوانانی ئەم سیاسەتانەش ئەمەریکاو ڕۆژئاواو دامەزراوە سەربازییەکانن، بۆیە ئیسلامی سیاسی هەتا ئێستاش نەیتوانیوە سیناریۆکە بەتەواوی نمایش بکات سیاسەتی دەرەکی تورکیا لەنێوان سێ ڕێڕەودایە، ڕێڕەو بەرەو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەرەو ڕۆژئاوا، بەرەو لای ئیسلامیەکان، گەر بێتو سیاسەتی دەرەوە بەرەو لای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەنگاو بنێ ئەوا ڕۆژهەڵاتیەکان نایەڵن بەرەو ڕۆژئاوا بڕوات بەمانایەکی تر نامۆ دەبێ بەڕۆژئاوا، وە تورکیاش کاتی خۆی دانی بەدەوڵەتی ئیسرائیلدا ناوە پاش دان پیانانی ئەمەریکا بەدوو مانگ، لە پەیمانەکەی ساڵی ١٩٥٥ لەشاری بغداد، لەکاتی جەنگی ساردا دژی یەکێتی سۆڤیەت وەستایەوە.

لەگەڵ ئەمەشدا لە حەفتاکاندا ئیسرائیل پەیوەندییەکی دۆستانەی هەبوو لەگەڵ عەرەبدا بەمەبەستی چنگ کەوتنی پەترۆل.سیاسەتی دەرەوەی تورکیا هەمیشە چاوێکی لەسەر ڕۆژئاوا بووە چاوەکەی تریشی لەسەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و دەوڵەتە ئیسلامیەکان بووە هاتنە سەرکاری ئەربەکانیش بۆ سەر حوکم ئەم حاڵەتە ئیزدواجیەی نەگۆڕی لەڕاستیدا دیبلۆماسیەتی تورکی کلاوێك و (تەربووشێك)ی خستۆتە سەر خۆی هەمیشە کلاوەکەی لەسەردایە بەلام ئەیەوێت تەربووشەکەشی دەرکەوێ بەپێی پێویست، لەوکاتانەی ئەکەوێتە ژێر فشاری دەرەو ناوەوە.

سیاسەتی دەرەوەی تورکیا ئاوێنەی کێشە ناوخۆییەکانەو ململانێی نێوان ئیسلامیەکان و پیاوە سەربازییەکانی تیا دەبینرێ هەروەك پرۆفیسۆر (فیلیب روبنز) شارەزای سیاسەتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لەزانکۆی ئۆکسفۆرد ڕوونی کردۆتەوە دەڵێ:

سیاسەتی دەرەوەی تورکیا ڕەنگدانەوەی ململانێی نێوان دامەزراوە سەربازییەکان - عیلمانیەکان و ئیسلامیەکانە، وە عیلمانیەکان خۆیان بە پاسەوانی کۆماری ئەتاتورك دەزانن وە ئیسلامیەکانیش هەوڵ ئەدەن لە پێناو موسڵمانگەرایی تورکیاو ڕێگرتن لەزیادەڕۆییەکانی عیلمانیەکان کە (٧٥)ساڵە دەوڵەت بنیاتی ناوە تێدەکۆشن.

گروپە ئیسلامیەکان مەبەستیانە مۆرك و شەقڵێکی ئیسلامیانە بنێن بە تورکیای ئەورووپیو ئەندامی ناتۆوە، ڕێڕەوی خۆی بەرەو ئۆقیانووسی عەرەبیو ئیسلامیەکان درێژکاتەوە، کێشە نەتەوەییەکانی نێوان تورك و کوردپاکتاو بکات لەڕوانگەیەکی ئیسلامیەوە چارەسەری بکات بەشێوەیەك هەردوو گەلی تورك و کورد برای یەکتر بن و گەلێکی موسڵمانن.

دامەزراوە سەربازییە عیلمانیەکان پێچەوانەی ئەم ڕایەن ڕقەبەرایەتیو دووبەرەکیان هەیە لەگەڵ ئۆقیانووسی عەرەبیو ئیسلامی لەبری ئەمەش،

پەیمانە ستراتیجیەکانی ئیسرائیلیان لاپەسەندترەو چارەسەری مەسەلەی کوردیش دەبێت بەهێزی سەربازی بکەن...

ئەم سیاسەتە ناتەباو ناکۆکانە لەبوارە عەمەلیەکانیشدا پیادە دەکرا بۆ نموونە هەر لەو ساتانەدا ئەستەنبوول کۆبوونەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە دی لەهەشت دەوڵەتی ئیسلامی پێك هاتبوو لەمانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٧دا بوو، دامەزراوە سەربازییەکان بەشێوە زمانێکی زۆر توندو تیژانە بەرامبەر ئێران وسوریا دووان کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئەگەری داخستنی باڵوێزخانەکان بێتە ئاراوەو گەلەکۆمەکی سەربازیش بکرێت لەسەر سنووری ئەم دوو وولاتە، کەچی ئەربەکان لەبری ئەمە ڕێکەوتنامەیەکی گەورەی ئیمزا کرد لەگەڵ ئێران بەبڕی (٢٠) ملیار دۆلار بۆ هێنانە ناوەوەی گازی ئێرانی، پاش ئەمەش سەردانی لیبیای کردو ڕای گەیاند پەیوەندییەکانی لەگەڵ سوریا چاك دەکاتەوە وە لەمەبەدوا ئاڵوگۆڕی بازرگانیش لەگەڵ عێراقدا دەکات.

وە کاتێك ئەربەکان ڕەخنەکانی خۆی بەرزکردەوە بەرامبەر هاوکارییە سەربازییەکەی تورکیاو ئیسرائیل ساڵی ١٩٩٦، لەدژی ئەم هەڵوێستە دامەزراوە سەربازییەکانیش بڕیاریان دا هەستن بە مانۆڕێکی دەریاییو ئاسمانی بەهاوبەشی لەگەڵ ئیسرائیل و ئەمەریکاو لەگەڵ پاشەکەوت کردنی چەك و تەقەمەنیەکی زۆر بۆ حاڵەتی نائاسایی، وە دانانی بەرنامەیەکی نوێ لەشێوەی (جفرە) بۆ دەنگ و باس و هەواڵ گۆڕینە لەنێوان خۆیان و ئیسرائیل دا...

مەرامەکانی ئیسرائیل و ئەمەریکا ئاشکرا بون و هەل و فرسەتەکانیان دەقۆزتەوە لە پێناو دەست بەسەراگرتنی قەیرانەکانی ناوخۆی تورکیاو چەسپاندنی تورکیا لەناو ستراتیجیەتی ڕۆژئاوادا.

# پێکادانی سوپاو ڕەفای ئیسلامی

**(ئێمە وەك سوپا سوورین لەسەر پاراستنی سیستەمی کۆماری دیموکراتی عیلمانی، ئامادەین قوربانی بەگیانی خۆمان بدەین)**

**((سەرۆکی ئەرکان جەنەراڵ اسماعیل حقی کەرادای))**

پاش دورکەوتنەوەی حیزبی ڕەفا لە حوکم و پاش هەفتەیەك بەسەر ئەم گۆڕانکارییەدا جۆرە ئالۆزییەك پەیدا بوو، لەنێوان سوپاو حیزبی ڕەفا، قسەو باس هاتەکایەوە بەوەی کۆدەتایەك پەیدا بووە، بەڵام سوپا هەرزوو ئەم کودەتا سەربازییەی گۆڕی بۆ کودەتایەکی مەدەنی، دەست کێشانەوەی نەجمەدین ئەربەکان لەسەرۆکی حکومەت بەڕەزامەندی تانسۆ چیلەر بوو بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەی لەگەڵ حیزبی ڕێگای ڕاست دا کردبووی کەدەبێت لەساڵی ١٩٨٨دا گۆڕانکاری لەسەرۆك وەزیراندا بکرێت، ئەو گۆڕانکارییە سەرۆکی حیزبی ڕەفای نزیك دەکردەوە لەڕووبەڕوونەوەی سوپا، بۆیە پێیخۆش بووهەڵبژاردنی پەرلەمانیتازە ئەنجام بدرێت پێی وابوو هەڵبژاردن دەبێتە هۆکارێکی یاریدەدەر بۆ چارەسەری ئەو کێشانەی لەگەڵ سوپا هەیبوو، وە بۆ خورزگارکردن لێی بەڵام ئایا ئەربەکان لەماوەی ئەو ساڵەی لە حوکم دا بوو چی کردووە، لەکاتێکدا خۆی دەبینێتەوە ڕووبەڕووی سووپا بۆتەوە؟

# دەستکەوتەکانی ئەربەکان بۆ تورکیا

لەبورای ئابووریدا بەپێی ووتەکانی جێگری سەرۆکی ڕەفاو وەزیری دەوڵەت: (هاتنە خوارەوەی تێکڕای هەڵئاوسان، کەم بوونەوەی قەرزەکان، زیادبوونی مووچە) بوە بەڵام نەیارانی ڕەفا نکۆڵی لەم دیاردانە دەکەن دەڵێن هیچ دەستکەوتێك لەم بابەتانە بوونی نەبووە تەنها پڕوپاگەندەیەکەو هیچی تر

(سیفی چان)سەرۆکی پەیمانگای سیاسەتی دەرەکی لە ئەنقەرە دەڵێت: هەڵئاوسان دانەبەزیووە قەرزەکانی ناوخۆش وەکو خۆیان وان هیچ پڕۆژەیەك لە دێهاتەکاندا نەکراوەو هیچ شتێك نەکراوە بۆ هەستانەوەی ژێرخانی کۆمەڵ...

لەلایەنی سیاسەتی دەرەوەدا پرۆفیسۆر (فیلیب روبنن) جەخت لەسەر ئەوە دەکات کەسیاسەتی دەرەوەی ئەربەکان درێژە دانە بە سیاسەتە کلاسیکیەی پێش خۆی پەیوەندییەکانیشی لەچەند ناوچەیەکی وەك ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکان و عێراق و قوبرس و ئیسرائیل خۆی دەبینێتەوە.

بەڵام پرۆفیسۆر سیفی چان دەڵێت: ئەربەکان شتێکی تازەتری خستە سەر سیاسەتەکانی دەرەوە کە دوایین سیاسەتی کۆبوونەوەی هەشت دەوڵەتە ئیسلامیەکە بوو ئەمەش ڕووپۆشێك بوو بۆ سیاسەتە دوولایەنەکان چونکە لەپاڵ ئەمەشدا ئەربەکان ڕێکەوتنی (یەکێتی گومرگی) لەگەڵ ئەوروپادا مۆرکرد ماوەیەك لەوەو پێش خۆی ناڕازی بوو بەم ڕێکەوتنە، وە ماوەی پرۆسەی چەکوشی ئامادەی درێژ کردەوە لە باکوری عێراق کە خۆی ناوی لێنا بوو (هێزە صەلیبیەکان).

# ئەربەکان دزە دەکاتە ناو سوپاو ناو کۆمەڵگا

گەر ئەربەکان لەوکاتانەی سەرۆکی حکومەت بووە هیچ ڕەنگدانەوەیەکی نەبووبێ لەسەر سیاسەتی ئابووری تورکیاو هیچ تازەگەرییەکی نەخستبێتە سەر سیاسەتی دەرەوەی تورکیا کەچی ئیسلامیەتی ئەربەکان جێ پەنجەی دیارە لەبوارەکانی ئابووریو فێرکردن ودزەکردن بۆ ناو سوپا...

ئەربەکانیەت نوێنەرایەتی بنکەیەکی ئابووری ئیسلامی گرتبووە بەر، چەند ڕێکخراوێك و کۆمپانیایەکی ئیسلامی ڕێکخستبوو بەرچاوترینیان ڕێکخراوی (رجال الاعمال المسلمین –MUSIAD )بوو کەسێ هەزار پیاوی گرتبووە خۆ هەموویان هەواداری حیزبی ڕەفا بوون نوێنەریان هەبوو لە (١٠) هەزار کۆمپانیا ئیش و

کارەکانیان لەسەر ئاستی بازرگانیو کارگەکانی دروست کردن و بابەتی خۆراك و کەل و پەلی ناومالْ و بانکەکان و فرۆکەخانەکان و تەنانەت لە رۆژنامەو کەناڵە تەلەفزیونیەکانیشدا بوون، ئەم کۆمەڵە ئیسلامیانە بوونە هەڵسورێنەرێکی ئابووری، ئەریەکان ناوی دەبردن بە (پلْنگە ئیسلامیەکانی ئەنادۆلْ)...

هەروەها پەلی هاویشتبووە ناو بوارەکانی (فێرکردن)وە، مزگەوتەکان بوو بوونە قوتابخانەیەك بۆ فێرکردنی گەورەو بچووك و خەتمی قورئان بەبێ رەزامەندی یاسایی، گەڕان و چاودێری کردنی پۆلیس بەدەوری مزگەوت و ماڵەکاندا بوو بووە کارێکی رۆژانە دەزگا ئایینیەکانی ئەریەکان نزیکەی (٥) هەزار خوێندنگای سەرەتاییان کردبوو بە شوێنی فێرکردن وانە ئاینیەکان، وە (٤٠) قوتابخانەی ناوەندییان کردبوو بەجێگای فێرکردنی پێش نوێژیو پێگەیاندنی ئیمامی ئاینی جگە لە ئامادەکردنی (١٥) هەزار کەس بۆ خەتم پێکردنی قورئان.

پاش ئەمەی کە دزەکرایە ناو ئابووریو فێرکردنەوە بەرەو دام و دەزگاکانی ناو سوپا خۆیان کێش کرد، لێکۆڵەرەوەیتورکی (ساجلار کیدر) دەڵێ: پیاوە ناودارەکانی ناو سوپای تورکیا نزیکەی (٨٠٠) کەسن پشتیان بەستووە بەدەستەو تاقم و توێژە مام ناوەندیەکان، گەشەکردنی ئەریەکانیش لەناو کۆمەڵگادا هەمان گەشەکردن بوو لەناو ئەو دەستەو تاقم و توێژانەدا، ئەمانەش بەشێك بوون لەناو سوپادا بەپلەو پایەی جیاواز، ساڵی ١٩٩٥ راپرسیەك لەناو سوپادا کرا پێش هەڵبژاردنەکەی ئەو ساڵە، ٣٨٪ی ناڕازی بوون بە پەرپاکردنی کودەتا لەدژی حیزبی رەفا گەربێتو لە هەڵبژاردندا سەرکەوون و حکومەت پێك بێنن.

# خۆ سووركردنەوەی سوپا بەرامبەر ڕەفا:

بنج داكوتان لـە بوارەكـانی فـێركردن و ناوسـوپاو لایەنـە ئابوورییـەكان پرۆژەیەك بوو لە پێناو داهاتوویەكی مسۆگەر، ئەربەكان هەوڵی بۆ دابوو (سەمیح ئەدیز ) نووسەری توركی دەڵێـت: ئـەو گەمـە سیاسیـەی ڕەفـا پـیـ‌ی هەسـتاوە، توانـای حـەلاڵ كـردن و دەسـتە مۆكردنـی ئـەم گەمەیـەی نیـە چونكـە لایـەنێكی تەنـهان لـەو گەمەیـەدا. ئـەم ڕایـەش لەگـەڵ ووتەكـەی (ممتـاز سوسـیال) یەكدەگرێتەوە كە دەڵێت: ئەربەكان بیری چۆتـەوە ٢١٪ی دەنگەكانی بەدەست هێناوە دەبێ بزانێت كەزۆرینە نیـە. سـوپا نیگـەران بـوو لـەو هـەڵس و كەوتـەی ئەربەكان گرتبوویە بەر ئەوەی زیـاتر نیگـەرانی كردبـوون درێـژە بوونـەوەی ئـەم ڕەوتە ئیسلامیە بوو بۆ ناو خـودی سـوپا. ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی لـەڕۆژی ٢٨ی فـبرایری سـاڵی ١٩٩٧( ئەنجوومـەنی ئاسایشـی نەتـەوەیی) پێـك هـاتبوون لەسەركردەكانی ناو ئەركان (١٨) خاڵیان نووسیەوە بەمەبەستی لێپرسینەوەو بە ئاگاهاتنەوە خرایە بەردەم حكومەت بۆ جێبەجێكردن:-

١-قەدەغـەكردنی هـەر جـۆرە بانگهێشـتنێك بـۆ جێبـەجێكردنی شـەریعەكانی ئیسلام.

٢-چاودێری دانان لەسەر تۆرەكانی پەخشی ئێستگەو تەلەفزیۆنەئیسلامیەكان.

٣-قەدەغەكردنی پۆشاكی ئیسلامی ئافرەتان.

٤-لێپرسینەوەو لێكۆڵینەوە لەگەڵ ئیسلامیە هەرە بەرچاوەكانی ناو دەزگاكـانی دەوڵەت.

٥-چاودێرییەكی توند لەسەر ئەو كەسانەی تفەنگی بێ قۆناغ دەكڕن.

٦-چاودێری لەسەر دارایی‌و دەرامەتی كۆمەڵەو ڕێكخراوە ئیسلامیەكان.

٧-زیندوكردنەوەی مادەی (١٦٣) لەیاسای سزادان ناوەڕۆكی مادەكەش ڕێگرتنە لەهەر چالاكیەكی سیاسی گەر ئامانجێكی ئاینی لەدواوە بێت.

٨-چاودێریکردن لەسەر پیلانەکانی ئێران لەلایەن حکومەتەوە تا سیستەمی عیلمانی تورکی نەشێوێت.
٩-مەحکوم کردنی هەر جۆرە کارێك و بەشێوەیەکی ڕەها کەلەدژی سیستەمی دیموکراتی عیلمانی بێت.
١٠-جێبەجێکردنی مادەی ١٧٤لەدەستوور، تایبەتە بەڕیفۆرمەکان لەژێر ئالآی کۆماری تورکی وە لەساڵی ١٩٢٣ ئەم یاسایە دانرا.
١١-لێپرسینەوە لەو کەسانەی سەرپێچی یاسا دەکەن، داخستنی ئەو دامەزراوە ئاینییەی کەسەرپێچییەکەی لێوە کراوە.
١٢-زیادکردنی مادەی فێربوونی ئیلزامی بۆ (٨)ساڵ.
١٣-داخستنی ئەو خوێندنگایانەی بەمەبەستی فێربوونی قورئان لەلایەن ئوسوڵیەکانەوە بەڕێوە دەچێ.
١٤-پرسیار کردن لەسەرۆکی حیزبەکان دەربارەی ئەو بەیان و ئاگاداریو ڕوونکردنەوانەی دەری دەکەن.
١٥-(ئەنجوومەنی شارەوانیەکان) ئاگادار بکرێنەوە، ئەو پارەو پولانەی لەدەرەوەی وولآت دێن بۆ ڕێکخراوە ئاینیەکان هیچ ئاڵوگۆڕێکیان بۆ نەکرێت.
١٦-قەدەغەکردنی مزگەوتی تازە لەگەڕەکی (تەقسیم) لەئەستەنبوڵ.
١٧-لەکارخستنی (١٦٠) ئەفسەری ناو سوپا بەهۆی بیروڕا ئاینیەکەیانەوە.
١٨-لەکارخستنی هەندێ لەحاکمی ویلایەتەکان لەبەر ئەوەی سەر بەبزووتنەوەیەکی ئاینی بوون.

هەڵس و کەوتەکانی ئەربەکان دەبووە هۆی ئەگەری نزیك بوونەوەی پێکادان لەگەڵ سوپادا، کاتێ ئەم یاسایانە بڵاوکرایەوە ویستی لانی کەم هەندێ شت بکات و هەندێ لەداواکانی سوپا بەجێبهێنێت وە ژمارەی (١٢٠) خوێندنگا لە خوێندنگاکانی خۆی داخست.

هەیئەی ئەرکانی هێزە چەکدارەکان ڕاپۆرتێکی لەژێر ناونیشانی (بەرفراوان بوونی ئیسلامی سیاسی) بڵاوکردەوە ڕوونی کردەوە کە حیزبی ڕەفا خۆی

ئامادەکردووە بۆ ساڵی (٢٠٠٠) وای نیشان داوە تا ساڵی (٢٠٠٠) ژمارەی ئەندامەکانیان بگاتە ٨٥ هەزار کەس وەتا ساڵی (٢٠٠٥) دەگاتە (١,٥) ملیۆن دەنگ بەنیازن (١,٧)ملیۆن منداڵ پەروەردە بکەن لەسەر قورئان و ساڵی (٢٠٠٠)سوودیان لێدەبینرێ بۆ دەنگ دان جگە لەوەی (٧) ملیۆن دەنگیان هەیە لە ئێستادا. دوای سێ ڕۆژ لەم ڕوونکرنەوەیە سەرۆك ئەربەکان بەاسماعیل قارادای ڕاگەیاند کە ئێمە سوورین لەسەر پاراستنی سیستەمی کۆماری دیموکراتی عیلمانی، ئامادەین قوربانی بەگیانمان بدەین.

خۆ سوورکردنەوەی سوپا تاکۆتایی ساڵی ١٩٩٧ بەردەوام بوو هەڕەشەکانی خۆیان ئاراستەی ئیسلامیەکان دەکرد لەیەکێك لەڕۆژنامەکاندا ڕایانگەیاند: سوپا وایدەبینێ ئیسلامیە ئوسولیەکان وکوردە جوداخوازەکان زۆر مەترسیدارترن لەو مەترسیانەی لەدەرەوە بۆمان دێت،وە کوردەکان هاوکاری ئیسلامیە توندڕەوەکان دەکەن وە لەباکوری عێراقدا مەشقیان پێدەکەن پێویستە سوپا بەرەو ڕویان بجووڵێت و سەرکوتیان بکات، ئەم ڕاگەیاندنەی سوپا تەنها پاساوێك بوو بۆ کردەوە سەربازییەکان و هاتنە ناوەوە بۆ باکووری عێراق.

# دەوڵەتێکی بەهێز و حکومەتێکی لاواز

پاش گرتنە دەستی دەسەلات و حوکم کردنی لەماوەی ساڵێکدا ئەربەکان بۆی دەرکەوت دەوڵەت بەهێزترە لە حکومەتەکەی. دەوڵەتیش بریتی‌یە لە دامەزراوێکی سەربازیو عیلمانی ئەربەکان کۆتایی بە پڕۆژەکانی هێناو کۆتایی بەدەسەلاتی خۆشی هێنا ناچار بوو جێگاکەی خۆی جێبهێڵی بۆ (تانسۆ چیلەر). دەست لەکار کێشانەوەی ئەربەکان لە حوکم کۆتایی بە ژیانی ئەربەکان نەهێنا، سوپا هەمیشە چاویان لەسەر بوو چاودێریان دەکرد سەرچاوەیەکی سەربازی لە هەیئەی ئەرکانەوە ووتی گەر بێتوو حکومەتێکی

ئیئتلافی تازە لەنێوان (چیلەرو ئەربەکان) بێتە کایەوە، تورکیا لـەناوەو دەرەوە لە جووڵە دەکەوێت زیان بە پرنسیپە دیموکراتیەکان دەکەوێت.

پاش ئەمە سەرچاوەیەکی سەربازی تر رایگەیاند کۆبوونەوە یەك لەدوای یەکەکانی سەرکردەکانی سوپا دەریدەخات هیچ هیوایەك لەم حکومەتە تازەیەدا نابینریۆ لە حکومەتەکەی ئەربەکان باشترنابێت. وە لەکاتی دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکاندا دەزگاکانی سوپا جم و جوڵەکانی خۆیان زیاد دەکرد بەناو هەموو ناوچەکانی تورکیا بڵاودەبوونەوە تا بۆ خەڵکی بسەلمێنن کە حیزبی ڕەفا میسداقیەی خۆی لەدەست داوەو ئەو دەمامکە لەڕوویان داماڵن...

بەرپا بوونی ئەو کودەتا مەدەنیە لەسەر داوای سەرۆك (دیمیریل) بوو مەسعود یەڵماز هەستا بەم کۆدەتایەو جگە لە ١٢٩ کورسی لەکۆی ٥٠٠ کورسی هیچی تری بەرنەکەوت لەم حکومەتە تازەیەدا، ئەم پرۆسەیە ئەلتەرناتیڤێك بوو لەجیاتی ڕوودانی کۆدەتای سەربازی بەڕێگا چارەیەکی باشیان دانا بۆ نەهێشتنی ناکۆکیەکانی نێوان سوپاو ڕەفای ئیسلامی. وە دوورکەوتنەوەی ئەربەکان و ڕەفا هیچ گرفتێکی چارەسەر نەکرد، دەوڵەتی تورکیا بەدووریان نەدەزانی جارێکی تر ئەربەکان و حیزبەکەی بێنەوە ناو حکومەت.

لەلێکۆڵینەوەیەکدا پەیمانگای دەولی ئەمەریکی کردبووی، پێیان وابوو لەهەڵبژاردنە پەرلەمانیەکەی داهاتوودا، حیزبی ڕەفا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت بۆ جارێکی تر کێشەی نێوان سوپاو ڕەفا سەرهەڵدەداتەوە گەر ئەمە ڕوویدا ڕەفا زۆرینەی بەدەست هێناو سوپا ڕووبەڕووی وەستایەوە ئەوا سیمای حیزبی ڕەفا دەگۆڕێت بۆ شتێکی تر لەبابەتی (بەرەی ڕزگاری جزائیر - جبهة الانقاذ) و تورکیا دەبێتە نموونەی دووەمی جەزائیر.

بەرنامەی کۆدەتا مەدەنیەکەی سوپا پـیـێ هەستا، تەنها دوورخستنەوەی ئەربەکان و حیزبی ڕەفا نەبوو لەسەرۆکایەتی حکومەت، پەکخستن و گۆشەگیر کردن و هەوڵدانێك بوو بۆ پاکتاو کردنی ئیسلامی سیاسی تورکی.

# یەڵمازو بەجێگەیاندنی ڕاسپاردەکان

پاش دوورکەوتنەوەی نەجمەدین ئەربەکان و حیزبی ڕەفا لە حوکم لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٧، مسعود یەڵماز تەرخان کرا بۆ دروست کردنی حکومەتێکی نوێ لەبەر دوو هۆ:

١-یەڵماز زیاتر لەچەند جارێك سەلماندبووی گوێڕایەڵی دامەزراوە سەربازییەکانە.

٢-پەیوەندی بەخاڵی یەکەمەوە هەیە سوپا خۆشی دەیوویست حکومەتەکەی یەڵماز لەژێر ڕاسپاردەکانی خۆی دابێت.

بۆ بنەبڕکردنی ڕووبەڕووبونەوە لەنێوان سوپاو ئیسلامی سیاسی چەند گۆڕانکاریەکی ئەنجام دا وەك: فێرکردنی ئیلزامی کرد بە (٨)ساڵ، ئەمەش مانای داخستنی دەرگای پەیمانگای (امام – خطیب)بوو، قەدەغە کردنی سەرداپۆشین لە قوتابخانەو زانکۆکان و شوێنی کارو فەرمانگەکان گرنگترین گۆڕانکاری تر کەویستیان بیکەن هەڵوەشاندنەوەی حیزبی ڕەفا بوو.

بەکورتی حکومەتی یەڵماز دوو ماهیەتی هەبوو: بەجێگەیاندنی ڕاسپاردە سەربازییەکان و وەستان بەرامبەر تەوژمی ئیسلامی لەتورکیا. گوێڕایەڵی و دیسپلینەکانی یەڵماز بۆ پیاوە سەربازییەکان و هەڵسوڕانی لەژێر ئیرادەی ئەوان پێچەوانەی بنەما دەستووریەکان بوو. ئەم حاڵەتە لەدوو بۆنەدا بەزەقی دەبینران :-

١- لەمانگی دووی ساڵی ١٩٩٦ سوپا فشاری خستە سەر یەڵماز تاکو لەگەڵ حیزبی ڕەفا ڕێك نەکەوێت بۆ دروست کردنی حکومەتێکی ئیسلامی، یەڵمازیش هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو بۆ ئەم داوایەو بەڕەسمی قبوولٚ کردنی ئەم داوایەی سوپای ڕاگەیاند. هەروەها لە بۆنەیەکی تردا هەمان هەڵوێستی هەبوو ئەویش لەکاتی ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی نێوان سوپاو ڕەفای مانگی شوباتی ١٩٩٧

بەراشکاوی داوای بەرپا کردنی کودەتایەکی دەکرد تا کۆتایی بەدەسەلاتی ئەربەکان و چیلەر بهێنێ.

بەهۆی ڕاگەیاندنی ئەم هەڵوێستە سلبییەوە یەڵماز دەیویست بەبەردێك دوو نیشانە بپێکێ لەلایەك دژایەتی کردنی ئیسلامیەکان و لەلایەکی ترەوە لووت شکاندنی (چیلەر)ی موونافسی بوو کە نوێنەرایەتی باڵی ڕاستی دەکرد.

سلێمان دیمیریل وەك سەرۆك کۆمارێك پاساوی دەهێنایەوە بۆ یەڵماز، حوکم کردنەکەی بە حەقیقەتێکی دەستووری دادەناو لێپرسراوێتی زۆرینەی ناو پەرلەمانیشی پێدا وەك سەرۆکی ئەو زۆرینەیە، پاش دەست لەکار کیشانەوەی سەرۆك وەزیرانی پێشوو (ئەربەکان)، ئەو فرتوفێڵەی دیمریل لێیکرد بەهۆی فشارەکانی دامەزراوە سەربازییەکانەوە ناچار کرا ئەم فەرمانە جێبەجێبکات دورکەوێتەوە هەرچەندە خۆشی پێش وەخت لەگەڵ چیلەردا ڕێکەوت بوو تەنها بۆ ماوەیەکی دیاری کراو حوکم بکات. ئەو کاتەی دیمیریل داوای لە یەڵماز کرد بۆ دروست کردنی حکومەتێك گەمەیەکی ژێر بەژێری سازدا بوو لەگەڵ حیزبەنەیارەکانی لەلایەکەوەو لەگەڵ سوپادا لەلایەکی ترەوە تاوەکو ئەم حکومەتە نوێیە متمانەیەکی نوێ وەرگرێتەوە لەناو پەرلەمان، بۆ جێبەجێکردنی گەمەکەی، لەلایەکەوە سوپا دەستی کرد بەهەڕەشە لێکردنێکی ناڕاستەوخۆلەهەردوو حیزبی ئەربەکان و چیلەر (ڕێگای ڕاست و ڕەفا)، وە لەلایەکی ترەوە پەیمان و کۆمەکی ماددی ئەبەخشیە هەندێ لە ئەندامانی حیزبی ڕێگای ڕاست بۆ دوو کەرتبوونی حیزب و چوونە دەرەوەی هەندێکیان لە حیزب، وە کاتێك حیزبی ڕێگای ڕاست لە هەڵبژاردنەکەی مانگی ٩ی ١٩٩٥دا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەبردنەوەی ١٣٥ کورسی لەپەرلەمان وئەو کاتەی یەڵماز ڕاسپێررا بەدانانی حکومەت ژمارەی کورسیەکان کەم بوونەوە بۆ (١١٦)، دوای ئەمەش کەمتر بۆوە بۆ (٩٨) کورسی واتە حیزبەکەی یەڵماز (١٨)کەسی لێبووەوە، وە حیزبی ڕەفاش (٢)کەسیان بەشداریان نەکرد.

گەمەکانی دیمیریل بووە هۆی گۆڕینی نەخشەی پەرلەمانی تورکی هەروەك لەم خشتەیەی خوارەوە دیارە.

*********************

**(گۆڕانی نەخشەی پەرلەمانی تورکی لەماوەی هەڵبژاردنەکانی (١٩٩٥/١٢/٢٤) تاکو (١٩٩٧/٧/١)).**

| ناوی حیزبەکان | ١٩٩٥/١٢/٢٤ | ١٩٩٧/٧/١ |
|---|---|---|
| ڕەفا RP | ١٥٨ | ١٥٤ |
| ڕێگای ڕاست DYP | ١٣٥ | ١٠٧ |
| نیشتمانی دایك ANAP | ١٣٢ | ١٣٢ |
| چەپی دیموکراتی DSP | ٧٦ | ٦٧ |
| گەلی کۆماری CHP | ٤٩ | ٤٩ |
| یەکێتی مەزن BBP | – | ٨ |
| تورکیای دیموکراتی DTP | – | ١٢ |
| نەتەوە MP | – | ٢ |
| سەریەخۆ - بێ لایەنەکان | – | ١٧ |
| کورسی چۆڵ | – | ٢ |
| کۆی کورسیەکان | ٥٥٠ | ٥٥٠ |

پڕۆتۆ کۆڵەکەی حکومەتی یەڵماز ئیمزا کرا و لەسێ حیزبی عیلمانی پێك هاتبوون حزبی نیشتمانی دایك (یەڵمان) حیزبی چەپی دیموکراتی (ئەجەوید)، حیزبی تورکیای دیموکراتی بەسەرۆکایەتی (حسامەدین جەندرۆك)و هەرچەندە حیزبی گەلی کۆماری کە سەرۆکەکەی (دینز بایکال) بوو بەشداری نەکرد لە حکومەت بەڵام بەڵێنی دابوو لە پێناو بەرژەوەندی حکومەتەکەدا دەنگ بدەن و دووره پەرێز نەبن، پاشان دەست کرا بەدابەش کردنی شوێن و جێگاو پلەو پایە، حیزبی نیشتمانی دایك (١٢) وەزارەتی بەرکەوت یەڵماز خۆی سەرەك وەزیران بوو وە وەزیرەکانی ناووخۆو گەشت و گوزارو تەندروستیو نیشتەجێو ئاوەدانیو کشت و کاڵ و ووزەو داد لەئەندامەکانی حیزبی ڕێگای ڕاست بوون، وە حیزبی چەپی دیموکراتی(١١) وەزارەتی بەرکەوت حیزبی تورکیای دیموکراتی (٥) وەزارەتی بەرکەوت، وە کۆی وەزارەتەکان (٣٨) وەزارەت بوون.

ئەوەی ڕوونە زۆری کورسیە وەزارییەکان و دابەشکردنیان ڕازی کردنی ئەندامە وازهێنراوەکانی حکومەتە ئیئتلافیەکەی پێشوو بوو ئەمە لەلایەکەوە وەلەلایەکی تریشەوە ڕازی کردنی حیزبە بەشداربووەکانی ناو حکومەتە ئیئتلافیە تازەکە بوو بەپێی ئەو گەمەیەی نێوان دیمیریل و سوپا ئەنجامیان دابوو.

دوای ئەمە، ئیئتلافەکەی یەڵماز متمانەی پێبەخشرا بەڵام جۆری کۆبوونەوەکان وردە وردە تەم و مژ دایدەگرتن لە کۆبونەوەکەی ڕۆژی ١٢ی تەمووزی ساڵی ١٩٩٧ دا ئەم دیاردەیە بەزەقی دەرکەوت و دانیشتنەکە بووە خێسەو مۆرەلەیەك کردنی نێوان عەلمانیەکان و ئیسلامیەکان تا کار گەیشتە ئەوەی بێتە شەڕی دەستەو یەخە و ڕاکێشانی دەمانچە لەلایەن یەکێك لە پەرلەمانتارە ئیسلامیەکانەوە وە چەندین جاری تریش بەم جۆرە کۆبوونەوەکان حاڵەتی نائاساییان وەردەگرت و دانیشتنەکانیان دوا دەخست.

بۆ دەنگ دان بە متمانە پێکردنی ئەم ئیئتلافە لەکۆی (٥٥٠) دەنگ (٢٨١) کەسیان دەنگیان پێداو (٢٥٦) کەسیان لەدەنگداندا لەدژی وەستانەوە دوو ئەندامی تریش دەنگیان نەداو (٨) کەسی تر هەر نەهاتبوون بۆ دەنگ دان

زۆربەیان لە وازهێنراوەکانی ناوی حیزبی ڕێگای ڕاست بوون، وە یەڵماز دوای دەنگدانەکە پەیمانی‌دا پەلە بکات لە متمانە پێکردنی حکومەتەکەی کار بۆ ئەم مەبەستە بکات. بەڵێنیشی‌دا حکومەتە نوێیەکەی لەسەر هەمان ڕێڕەوی (مصطفی کەمال ئەتاتورك) بڕوات ووتی هەنگاوی یەکەم دەبێت هەموو شتێك بگەڕێتەوە سەر باری جارانی خۆی میللەت تێر بووە لە کێشەکان و میللەت دەیەوێت ئەو ساڵە ناخۆشانەی بیرچێتەوە لەکاتی حوکمی ئەربەکاندا بەسەری دەبرد جەماوەر تێکەڵاو بەجیهانی پێشکەوتوو بکەینەوە.

ئەمەش مانای دیاری کردنی دەسەڵاتی سوپایەو یەڵماز بەڕاستی‌و بێ پەردە ڕایگەیاند کە سوپا ئەربەکانی لابردووە کوْدەتای بەسەردا کردووەو پاشان لەدرێژەی ووتەکانیدا ووتی: حکومەتەکەی بەردەوام دەبێت لەو هەڵمەتەی سوپا کردوویەتیە سەر ئیسلامیەکان و ڕێگا نادەین بە ئوسووسڵیەکان جارێکی تر سەرهەڵدەنەوە هیچ بوارێکیان پێنادەین پشوویان لێدەبڕین.

دوای ئەم قۆناغە یەڵماز ئەوەی لەدەسەڵاتیدا هەبوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەربەکانیەکان چەند شتێکی ڕەمزی کرد و لەوانەش لەلایەن وەزیری ناوخۆوە (موراد بازۆغلۆ) وە، دوو لێپرسراوی ئاسایشی پێشووی تورکی بانگ کران بۆ لێکۆڵینەوە بەتاوانی دروست کردنی تۆڕێکی ئیسلامی لەناو دەزگای پۆلیس داو گوێگرتن لە ئامێری تەلەفۆنی جەنەڕاڵەکانی ناو سوپاو گواستنەوەی هەواڵ و دەنگ و باسەکانیان بۆ ئوسوولیەکانی ئەربەکان.

وە لەڕێگەی وەزیری ڕۆشنبیری‌یەوە ( ئەشتمان تالای) ڕێگەی لە چاککردنەوەی یەکێك لە مزگەوتەکانی ئەستەمبول گرت جگە لەمەش بەوەزیری دارایی ڕاگەیاند دەبێت لەناو وەزارەتەکەیدا پۆشاکی ئیسلامی‌و سەرپۆش قەدەغە بکرێت.

ئەو بوارو دەسەڵاتەی درابوو بە حکومەتەکەی یەڵماز بۆ زاڵ بوون بەسەر موسڵمانگەرایی دا لە سنوورێکی زۆر تەسکدا خۆی دەبینیەوە ئەویش تەنها قەدەغەکردنی سەرپۆش و ڕێگەنەدان بەفێربوونی بوارە ئاینیەکان بوو.

# ڕێگرتن لە فێربوونی وانە ئایینیەکان (خوێندگاکانی امام - خطیب)

کۆمارەکەی ئەتاتورك فێربوونیان کردبوو بە ئامرازێکی بنەڕەتی بۆ دروست کردن و بنیاتنانی کۆمەڵێکی عیلمانی، دەوڵەت لەساڵی ١٩٢٦ فێربوونی وانەی (نەتەوەو نەتەوەگەری) گرتبووە ئەستۆی خۆی لەژێر سەرپەرشتی وەزارەتی پەروەردە، وە لەگەڵ هاتنەکایەی سیستەمی فێرکردنی عیلمانی لەناو وڵاتدا بەربەستێکیان دانا لەڕووی زانستە ئایینیەکانداو قوستابخانەو کۆلیژە ئایینیەکانیان داخست و بەمردنی ئەتاتورکیش ئەم کارانە کۆتاییان نەهات و ساڵی ١٩٤٦ جەنەراڵ (عیسمەت ئینۆنۆ)ش هەمان ڕێبازی گرتە بەر وای لێکدەدایەوە ئایین خورافاتە میللەت بێهۆش دەکات و حکومەت ناچار دەکات بگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی پێش خۆی، ئەم حاڵەتە لە ١٩٤٧دا گۆڕاو تورکیا بۆ بەرپەرچ دانەوەی بیری کۆمۆنیستی ڕێگای‌دا لە خوێندگا تایبەتیەکاندا وانەکانی ئایین بخوێندرێ، وە ڕێگادرا لە قۆناغی ناوەندیشدا ئایین ببێتە یەکێك لەوانەکان وەساڵی ١٩٤٩ حکومەت بڕیاری‌دا وانەی تایبەتی هەبێت لەبارەی ئیمامەت و ووتاربێژیو هەندێ شتی تر. هەر لەو ساڵەدا لەزانکۆی ئەنقەرە کۆلیژێك دانرا بەناوی کۆلیژی (الالهیات) نزیك بوو لە کۆلیژەکانی (لاهوت)ەوە وانە ئایینیەکانی وەك فەلسەفەو مەنتیقی تیا دەوترایەوە. وە ساڵی ١٩٥١ حکومەت بڕیاری‌دا بەدانانی خوێندنگایەك بەناوی (امام -خطیب)وە مەبەست لێرەدا ئامادەکردن و پێگەیاندنی ووتاربێژیو پێش نوێژیو ئیمامەکان بوو لەساڵەکانی پەنجاکاندا ڕێژەی وەرگرتن لەم خوێندگایانەدا زیادی کرد وە تا ساڵی ١٩٦٠ ژمارەی خوێندکارەکانی گەیشتە (٤٤٥٨)کەس.

وە ساڵی ١٩٧٣ خوێندنگاکانی (امام -خطیب) بوونە خوێندنگایەکی ڕەسمی وە ڕێگا درا بە ئافرەتانیش تیا بخوێنن وە ساڵی ١٩٥١ ژمارەی ئەم خوێندنگایانە

گەیشتبووە (٦٠٠) خوێندنگاو نیوملیۆن قوتابی لە خۆگرتبوو سالانە (٢٥٠ هەزار کەس بڕوانامەیان وەردەگرت و لەوێوە بەرەو زانکۆکان دەچوون. هەتاکو ئێستا ژمارەی دەرچووانی (امام -خطیب)یەکێك بوو لە هۆکارەکانی پێکادانی حکومەتی ڕەفاو سوپا، لەبەر ئەوەی سوپا پێی وابوو سەرچاوەیەکی پێگەیاندنی کادیرو بنکەیەکی حیزبییە، خوێندنگاکانی (امام -خطیب) لە قۆناغی سەرەتاییدا مندالانی تەمەن (٥) سالانیان وەرگرت، وە بۆ دەست وەشاندن لەگروپە ئیسلامیەکان ڕۆژی ٢٨ی شوباتی سالی ١٩٩٧ بەیانێکی (ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) دەرچوو خالی سەرەکی بەیانەکە وەرگرتنی مندالان بوو لە خوێندنگاکاندا تەمەنی (٥) سالی کرایە (٨) سال واتە مەرجی وەگرتنی قوتابی دەبێت لە (٨) سال کەمتر نەبێت ئەمە ئیسلامیەکانی ورووژاند هانی دان بۆ خۆپیشاندان وەمانگرتن زۆربەی شارەکانی تورکیای گرتەوە بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژی ئەم یاسایە! (یەلماز)یش بەم کارانە سەغلەت بوو بۆیە بەرپەرچی ئەدانەوەو دەیووت ئیسلامیەکان لەبەر خاتری قەزیەی (فێرکردن) دەیانەوێ هانی جەماوەر بدەن بۆ گێرە شێوێنیو نموونەی بەرەی ڕزگاری جەزائیری بهێنەکایەوە لەدژی حکومەت.

ئەم ئاگادارییەی یەلماز دلی سوپای ڕازی نەکرد سوپا خۆی کەوتە چاودێری کۆمەلە ئیسلامیەکان داوای لە حکومەت کرد لێپرسینەوەیان لەگەلدا بکرێت. سوپا وای بۆ دەچوو کە حکومەت کەمتەرخەمە لەڕووداوەکانداو بەکاری تەواوی خۆی هەلناسێ لەدژی ئیسلامیەکان، یەلمازیش دەیوویست دامەزراوە سەربازییەکان دەست وەرنەدەنە ئەم جۆرە کارانەوە، لە ڕۆژی ٢٦ی ئابی ١٩٩٧ یەلماز بەدامەزراوە سەربازیەکانی ڕاگەیاند نابێت دەست وەردەنە ناو کاروباری حکومەتەوە ئەمە بەشێکە لەکاروبارەکانی حکومەت ئەرکی سەرشانی سوپا قەلاچۆکردنی(P.K.K) یەو پاراستنی وولاتە.

خۆپیشاندانەکان درێژبوونەوە بۆ ناو شارەکانی تری بۆرسەو قۆنیاو سێشاری تر یەلمازیش چارەسەرێکی مەوزوعی لانەبوو، بەهۆی ئەم سیاسەتەی یەلمازو

گۆشەگیربوون و دەستەوەستان لەئاست ڕووداوەکاندا ناچار سوپا ویستی خۆی بێتە ناوەوە، سوپا بەسەرۆکایەتی سەرۆکی ئەرکان (ئیسماعیل حەقی قارادای) خۆنمایشکردنێکی گەورەو مەزنی سازدا بۆ دڵنیا کردنەوەی سەلامەتی کۆماری تورکی عیلمانی، لەگەڵ ئەوەی خۆپیشاندانی ئیسلامیەکان بەردەوام بوو، دامەزراوە سەربازییەکان وەفدێکی خۆیان ناردە لای یەڵمازو ئاگادرایان کرد بۆ ئەم حاڵەتە کتوپڕەی ڕوویداوە پێویستە لە ئیسلامیەکان بدرێت بەڵام یەڵماز ویستی هێوریان کاتەوە جارێ ئەم کارە نەکرێت تا نەبێتە هۆی زیاتر شێواندنی باری ناوخۆ نەکاتە حاڵەتی تەقینەوە، ئەم قسانەی یەڵماز دڵی دامەزراوە سەربازییەکانی ڕازی نەکرد ئەوانیش زیاتر فشاریان دەخستە سەر یەڵماز تا یەڵماز ناچار بوو ڕۆژی ۳۰ی ئەیلوولی ١٩٧٧ ڕایگەیەنێ توندترین سزا دووچاری ئەو کەسانە دەبێتەوە پڕوپاگەندەو گێچەڵ دروست دەکەن لەدژی حکومەت ئەم یاسایەش خرایە ناو یاساکانی وەزارەتی دادەوە تا لەمەو دواش پەیڕەوی پێ بکەن ئەمەش جۆرێك بوو لە گەڕاندنەوەی مادەی ١٦٣ لەیاسای سزادان کەساڵی ١٩٩١ هەڵگیرابوو وە تایبەت بوو بە کۆت و بەندکردنی چالاکیە ئایینیەکان.

چۆك دادانی یەڵماز لەبەردەم دامەزراوە سەربازییەکانداو کەڵەکەبوونی قەیرانەکان لەسەر حکومەتەکەی بوونە هۆی کشانەوەی ئەندامێکی بەرزی حیزبەکەی بەناوی (علی جۆشکون) و کەپاشان پەیوەندی کرد بە قوتابیەکانی (امام –خطیب)وە دوای ئەمیش دوو ئەندامی تر وازیان لە حیزبی (نیشتمانی دایك) هێنا یەکێکیان (تورکوت ئۆزال)بوو برا گەورەی (تورگوت ئۆزال)بوو سیاسەتەکانی یەڵمازیان ڕەت کردەوە، ڕوون کردنەوەیەکیان بڵاوکردەوە بەناوی (شێواندنی بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن) ئەم بەیانەی دەرکرا کاری کردە سەر لایەنگرانی (فێربوونە ئایینیەکان) بارودۆخەکە بەرەو ئاڵۆزی ڕۆیشت و دەوڵەتیش لەهەڕەشەو چاوسوورکردنەوە زیاتر هیچیکەی پێنەبوو تا لەڕۆژی ١٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٧ ئەستەنبوول لەئاکامی بەردەوام بوونی ئەم حاڵەتەی ڕووداوێکی خوێناوی بەخۆیەوە بینیپێکداهەڵپژان ڕوویدا لەنێوان

خۆپیشاندەران و پۆلیس و جەندرمە بەدەیەها بریندارى لێکەوتــەوەو بەسـەدەها کەسیشیان لێگیرا.

پاش ئەم ڕوداوە بەدوو ڕۆژ پۆلیس دەورى مزگەوتى (ئـەنصارى)یـان دا لەشـارى ئەستنەبوول و نوێژکەرەکان لێیان هاتنە دەست و گۆڕەپـانى مزگەوتەکـە بـووە گۆڕەپانى خۆپیشاندان و هوتاف کێشان لەدژى یاساى فێرکردنـە ئایینى‌یـەکان و قسە پێگووتن بەو کەسانەى سەرپۆش قەدەغە دەکەن.

# سەرپۆش ... دوژمنی یەڵماز

سیستـەمى تورکیـا ئـارامى بەخۆیـەوە نـەدى، ئـەمجارە یــەڵماز لــەژێر ڕاسـپێرى سـوپا بــەرەو نەهێشـتنى سـەرپۆش جـووڵا، ئافرەتـە سـەرپۆش بەسەرەکان بووبوونە هێمایـەکى ئیسـلامى لەڕووبەڕووبوونـەوەى ئیسلامیەکان و عیلمانیـەکاندا، سـەرەتا سـاڵى خوێندنـى ٩٩٧–٩٩٨ لـە زانکۆکـان و دادگـاو نووسینگە حکومیەکان بڕیار درا سەرپۆش لەسەرکردن قەدەغە بێت، ئەم بڕیـارە جێبەجێکرا بەزەبرى خۆ پیشاندان و تێك هەڵچوونى نێوان ئافرەتە ئیسلامیەکان و ئافرەتـە عیلمـانى‌و میانڕەوەکـاندا ڕۆژى ١٤ى تشـرینى یەکـەمى سـاڵى ١٩٩٧ مـانگرتن لەبـەردەم دەرگـاى زانکۆکـاندا پـەیدا بـوو لەلایـەن ئافرەتـە سـەرپۆش بەسـەرەکان چونکـە ڕێگایـان پێنـەدرا بـوو بـەو شـێوەیە بچنـە زانکۆکانـەوە، سەرۆکى حیزبى (ڕاپەڕین -نهضة) حسن جلال کوزال پەیوەندى بەمانگرەکانـەوە کردو ئەم هەلەى قۆزتەوەو مانگرەکان بەردەوام بـوون لـە مـانگرتن وە بۆ ڕۆژى دووەم سەرۆکى حیزبى (ڕاپەڕین) بڕیارى مانگرتنى‌دا لەگەڵیاندا، لەوێوە بـەرەو ماڵى (پارێزگا) لەشارى (قۆنیا) کەوتنە ڕێ بۆ ڕۆژى دوایى مانگرتنـەکان پـەرەى سەند زۆربەى شارەکانى ئەسـتەنبوول و ئەنقـەرەو قۆنیـاى گرتـەوە هـەندێ لـە سەرۆکى شارەوانیەکان و ئەندامـەکانى ڕەفـا بەشـداربوون. مانگرتنـەکان بـەرەو گەورە بوون دەچوون لەشارو گوندو قەزاکانـەوە کچـە قوتابیـەکانى تـر دەهاتنـە پاڵیان، تاکوکار گەیشـتە ئـەو ڕادەیـەى پۆلیس قوتابیـە عیلمانیـەکانى هـاندەدا

گاڵتە بە مانگرتووەکان بکەن و تیرو توانجیان تێگرن پاشان بۆجارێکی تریش پێکاهەڵبژان ڕوویدا بەدەیەها کەس بریندار بوون و بەسەدەها کەسیش ڕاپێچی زیندانەکان کران.

هەرچەندە ڕوداوێکی جەرگ بڕ ڕوویدا کەچی جەنگی (سەرپۆش) کۆتایی نەهات و زیاتر تەکەتولەکەی یەڵماز ئەم ئاگرەیان خۆش دەکرد لەدژی یەڵمازو حکومەتەکەی، ئەم مەسەلەیە هەر بەرەوی هەبوو، مانگی یانزەی ساڵی ۱۹۹۷ کۆنگرەی پێنجەمی حیزب الله ی تورکی بەسترا وەفدی حیزبی ڕەفاو حیزبی ڕێگای ڕاست و وەفدێك لە قوتابیە سەرپۆش بەسەرەکانی زانکۆ ئامادەی کۆنگرەکە بوون دروشمێکیان بەرزکردبۆوە تیایا نوسرا بوو (ئەو دەستانە بشکێ کەدەست درێژی دەکەنە سەر سەرپۆش) ئەمەش نیشانەی درێژبوونەوەی ئەو جەنگەی پێشوو بوو، حکومەتی یەڵمازش بەردەوام بوو لەکارکردن بۆ قەدەغە کردنی سەرپۆش وەزارەتی پەروەردە لە مانگی یەکی ۱۹۹۸ دا بەرەسمی قەدەغەکردنی سەرپۆشی ڕاگەیاند لەو جێگایانەی پەیوەندیان بەوەزارەتەوە هەیەو داوای ناوی ئەو ئافرەتانەیان کرد کە بەرگی ئیسلامی دەپۆشن هەتا لەسەر کارەکانیان دەریانکەن.

مانگی مارتی ۱۹۹۸ خۆپێشاندانێکی گەورە لەبەردەم زانکۆی ئەنقەرە ڕویدا ژمارەیان (۳۰۰۰) قوتابی دەبوون لە کچان و کوڕان لەدژی سیاسەتی (سەرپۆش)... ئەمە وای کرد مەسعود یەڵماز ڕوونکردەوەیەکیان ئاراستە بکات و ڕاستی مەسەلەکەیان لێبشێوێنێ بڵێت: ئێمە بەهیچ قوتابیەکی کچمان نەگوتووە سەرپۆش بکەن یان نەیکەن.

دیاردەی سەرپۆش لەکۆتایی ساڵی ۱۹۲٦دا لەکاتی فەرزکردنی عیلمانیەت پەیدا بوو لەچوارچێوەی( تازەگەری–تحدیث)دا سەری هەڵدا ئەو کاتەی بەزۆر ئافرەتان فێردەکران سفووربن، ئەنجوومەنی شارەوانیەکان چەند یاسایەکیان دەرکرد و یەکێك لەوانە قەدەغەکردنی پانتۆڵ بوو لەجیاتی ئەمە بکرێت

بەتـەنووره ئەگـەر نـا ئـەوا مێردەكانیـان یـا خـزم و كەسـەكانیان ڕادەكێشـرێنە بەردەم دادگا.

سـاڵی ١٩٨٩، ١٩٩٣ دادگـای دەسـتووری توركیـا پشـگیری لەقەدەغـەكردنی سەرپۆش كرد ڕایگەیاند كەسەرپۆش هیمای كۆمەڵگای ئیسلامیە لەدژی دەوڵەتی عیلمانی، وە لە ڕوانگەی وولاتانی ڕۆژئاواوە، قەدەغەكردنی سەرپۆش نـاوەڕۆكی عیلمانیەتی دەوڵەتی توركی‌یەو ڕێزگرتنە لە ئافرەت، وە سەربەستی دەبەخشێتە ئافرەت، وەلەڕوانگەی ئافرەتە ئیسلامیە توركیەكانەوە سـەرپۆش كـردن هێمـای ئیسلامەو هەم سەربەستیشە لەهەردووكاتدا. سەرپۆش لای ئەوان پابـەند بوونـی یەكەمە بەخواوە، خـۆ پاراستنێكی نموونەییـە بەرامبـەر پیـاوان بـەرگری كـردن لەسەرپۆش بەرگری كردنە لەسەربەستی ئافرەت.

حـیزبی ڕەفـاش نـەیتوانی بـەپێی پێویسـت ڕەوتـی ڕوداوەكـان بـەلای خۆیـدا بشكێنێتەوە بەپێی ئەو گلەیی‌و گازەندەیەی لەلایـەن ئافرەتـە ئیسـلامیەكانەوە دەكرا بۆ نمونـە (فاتمـە كاریجا) پـارێزەرێكی ئیسـلامی بـوو بـەهۆی ئـەو جـل و بەرگەی لەبەریا بوو چوونە ناو هۆڵی دادگایـان لێ قەدەغـە كـرد بـوو وە دەڵێـت: لیستەكەی حیزبی ڕەفا كەئامادەی كردبوو بـۆ هـەڵبژاردن ژمارەیـەكی زۆر كـەم ئافرەتیان تێكردبوو وەكاتێكیش دەسەڵاتیان گرتە دەست هیچ جێگاو شوێنێكی گرنگیان بەو ئافرەتە ژمارە كەمانە نەدا، لەبەر ئەوەی تا ئێستاش بیرۆكەی باوك سالاری زاڵە بەسـەر بیركردنـەوەی پیاوەكـان لـەحیزبدا، حـیزبی ڕەفـا ئافرەتـان تەنها وەك ئامرازێكی حیزبی بەكار دەهێنن لەشـەقامەكاندا وەك نـەیارانی حوكـم پێشانیان ئەدەن، خۆیان نایانەوێ نەدەسـەڵاتی حكومـی نـە دەسـەڵاتی حـیزبی بگرینە دەست.

# قەدەغەکردن و لەکارخستنی حیزبی ڕەفا

بڕیاری دەرچوونی هەڵوەشاندنەوی حیزبی ڕەفا لەلایەن دادگای دەستووری تورکیاوە لە ١٦ی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٩٨ بڕیارێکی کت و پڕ نەبوو. دەبێت بگەڕێینەوە بۆ ڕێژەی دەنگەکانی حیزبی ڕەفا کەکاتی خۆی ٢٠٪ی دەنگەکانی هێنابوو، کەواتە لە(٨٠٪)ی تری پشتگیری لەسوپاو حیزبە عیلمانیەکان دەکەن یاخوود حەز بە موسڵمانگەرایی تورکیا ناکەن.

وە لەڕاستیدا سوپا پارێزەری دەوڵەتی تورکیا بوو بەپێی ووتەکانی جێگری سەرۆك ئەرکان جەنەراڵ (شەفیق بیر)[٢] کەدەڵێت (تورکەکان بەچاوی ڕێزو خۆشەویستی‌یەوە دەڕواننە سوپا سەرباری ئەوەی ڕەخنەشیان لێدەگیرێت، بەڵام ئەمان قەڵاچۆکەری دوژمنانی ووڵاتن و نوێنەری مصطفی کمال ئەتاتورکن (بنیاتنەری تورکیای نوێ)، ئایا نابینن لەئەنادوڵ کاتێك کەسێك دەچێت بۆ خزمەتی سەربازی بەتەپڵ و زوڕناوە بەڕێ‌ی دەکەن و ساڵی ١٩٨٠ جەماوەر خۆیان یارمەتی جەنەراڵ کنعانیان دا بۆ سەرکەوتنی کۆدەتاکەی خۆشیان بۆ سەرۆك کۆماری هەڵیان بژارد).

ئاشکرایە پێش دەرچوونی بڕیاری دادگایی کردنی ئەربەکان کلاوێکی سیاسی‌و سەربازی پشت پەردەی کرا بوە سەر، بەرامبەر بەخۆی و بەحیزبەکەشی بۆ دڵنیا بوون لەم ڕایە پێش دادگایی کردنی ئەربەکان بەدوومانگ (دەعوا)یەکی بەرزکردوە بۆ بەردەم دادگا لەهەزار لاپەڕە پێك هاتبوو هەمووی بەرگریکردن بوو

---

(٢) (شەفیق بیر) پیاوێکی بەهێزو بەدەسەڵاتی تورکیایە لەمانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٨ بەسەرۆکی سوپا هەڵبژێردرا ئەندازیارێکی فیعلی بوو لە بۆ هەڵمەتکردن لەدژی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥، وە جێبەجێکەری ڕێکەوتنامەکانی تورکی _ئیسرائیلیە.

لەخۆیو لەحیزبەکەی دەیویست بەزۆر وازی پێنەهێنن لە حوکم، بەرپەرچی ئەو تاوانانەی دەدایەوە کە خرابوونە پاڵی گوایە بەنیازی دروست کردنی دەوڵەتێکی ئیسلامییە.

بۆ لەبەرچاو گرتنی ئەو یاسا ترسناکە ئەربەکان کەوتە جم و جۆڵ و لەکۆتایی مانگی دوانزەی ساڵی ۱۹۹۷ حیزبێکی تازەی بەناوی (الفضیلة) پێك هێنا بۆ ڕزگارکردنی حیزبی ڕەفا. هەموو کەسێك دەیزانی ئەو دادگاییەی بۆ ئەربەکان ئامادەکراوە بەپاکتاو کردنی قەزایی ڕەفاو سەرۆکەکەی کۆتایی دێت هەربەم شێوەیەی زانرابوو لەمانگی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹۹۸ دادگاییەکە کۆتایی پێهات، ناوەڕۆکی بڕیارەکانی دادگا ئەمانە بوون:—

—هەڵوەشاندنەوەی حیزبی ڕەفا.

—دەست بەسەراگرتنی دارایی‌و دەرامەتەکانی حیزب.

—بڕینی هەموو ئەو یارمەتیە مادیانەی لەدەوڵەتەوە وەری دەگرن.

—دەرکردنی ئەربەکان و ئەندامەکانی (ئەوانەی لە حیزبی ڕەفادان) لەناو پەرلەمان و لەکارخستنیان، قەدەغەکردنیان لەچالاکی‌سایی بۆ ماوەی (٥) ساڵ.

دوای دەرچوونی بڕیارەکان ئەربەکان داوای لە ئەندامەکانی حیزبەکەی کرد کۆبنەوەو کۆنگرەیەکی ڕۆژنامە نووسی بەست ووتی: داخستنی حیزبی ڕەفا کۆتایی شتەکان نیە بەڵکو خاڵی دەستپێکردنی ڕووداوەکانی مێژووە گەلی تورکی خۆی دەمانگەیەنێتەوە دەسەڵات لەداهاتوودا، چونکە خۆیان دەزانن کێ دەیان چەوسێنێتەوە داوا لەهەمووتان دەکەم هێمنی بپارێزن ڕێگا نەدەن دووبەرەکی‌و ئاژاوە هەڵگیرسێت بارپیزەکانمان دررزی تێنەکەوێت، خۆنمایشکردنەکانی ئەربەکان بەرەو هاتنە خوارەوەیەکی خێرا هاتن و ئەندامەکانیشی کۆتایی بەدەسەڵاتی سیاسیان هێنرا، وە لێرەدا جیاوازییەکی بەرچاو هەبو لەنێوان سیاسەتەکانی تورگوت ئۆزال و ئەربەکان ، ئۆزال پێچەوانەی ئەربەکان بوو حەزی لە نمایشکردن نەبوو پێی باش نەبوو وەك کەسێکی ئیسلامی دەرکەوتوو خۆی پیشاندا ئەوەی کردی گەڕانەوەی سیمای ئیسلامی تورکیا بوو بۆ دەوڵەت و

كۆمـەڵگا، مـەیلی گاڵتـە پێكردنـی نـەبوو بەدامـەزراوە سـەربازیو عیلمانیـە زیادەڕۆكان تاكو هەل بۆ بەرامبەرەكەی نەڕەخسێنێو زاڵ نەبن بەسەریدا.

كەچی سەرۆكی ڕەفا (ئەربەكان) پـێی وا بـوو حیزبەكـەی سوپایەكەو ئـەتوانێ لەبەرامبەر سوپای توركیا بووەستێتەوە ئـەم حاڵەتـە بەقسـەكانیەوە بـەڕوونی دیاربوو هەرگیز سیاسەتی (موسڵمانگەرایی) نەشاردۆتەوەو كاریشـی بـۆ دەكـرد، ئـەوەی توانیبێتـی لـەم بارەیـەوە كردبێتـی جێبـەجێكردنی (موسـڵمانگەرایی) ئامانجی یەكەم و ئامانجێكی جیدی بووە ئەمەش مافی خۆی بووە بەڵام لەگەمـە سیاسیەكان و زۆرانبازیەكانی دوولایەنی بەرانبەر بردنەوەو دۆڕاندنیشی تیایە.

لەلایەكی ترەوە تاوانێكی تری خرابووە پـاڵی لەلایـەن ئـەندامانی حیزبەكەیـەوە لەكاتی ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ سوپا وەك نووسـەری توركـی (طـه ئـەقیول) دەڵـێ تێك چوونـی نێـوان سـوپاو ڕەفـا بـەهۆی هەڵـەی حـەوت هەشـت كەسـی ئیسـلامیە توندڕەوەكـانی نـاو ڕەفـا بـوون بـەبێ بیركردنـەوە و بەهەڵەشـەیی دەستیان كردبوو بە جنێودان بەئەتاتورك و كۆماری عیلمانی توركیاو بونـە هـۆی شێواندنی وەزعەكان و تەقینەوەیان......

كاتێك دادگا بڕیاری داخستنی (حیزبی ڕەفا)یان دا ئاماژەیان كرد بەوەی حـیزبی ڕەفـا توركیـای گەیاندۆتـە كـەناری جـەنگی نـاوخۆو، بـەگۆڤارو ڕۆژنامـەكانیان ڕاگەیاند لەدژی ڕەفا بنووسـن سـەردرێری بابـەتێكیان نوسـرا بـوو (ئەندامـەكانی حـیزبی ڕەفـا خـەریكی خۆچـەكدار كردنــن) خـەڵكیان وا تێدەگـەیاند ڕەنگـە لەداهاتوودا توركیا ببێتە ئێران، كارگەیشتە ئەوەی سەرۆكی هـێزە دەریاییـەكان (جۆفن ئەقایا) بێتـە سـەر تەلـەفزیۆن و بڵـێ ئیسـلامیەكان بـەنیازی یـاخیبوونن لەشوێنە جیاجیاكاندا وەكو لەوەی لـە ئـێراندا ڕوویدا كـەچی لەگـەڵ ئـەم تـاوان باركردن و بوختانانەدا تەنانەت یەك دەلیلیان نەبوو لەدژی حـیزبی ڕەفـا ڕاسـتی قسەكانیانی پێ بسەلمێنن. گەروا بوایە هـەرزوو دەلیلـەكان بـەرز دەكرایـەوە بـۆ دادگای دەستووری دەوڵەت.

نووسەر لە کۆتایی قسەکانیدا دەڵێت: حیزبی ڕەفاش وەك باقی حیزبەکانی تر بێ هەڵە نەبووە هەڵەکانیشیان بریتی بوون لە (کامڵ نەبوونی عەقلی سیاسیان و دیماگۆجیەت لە ڕادەربڕینەکانیانداو خۆ دەرخستنیان لە قسەکردنداو هەندێ بیرو بۆچوونی ناعەقڵانی)...

وە لێرەوە پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا بە تەواوی کۆتایی بە ڕۆڵی سیاسی ئەربەکان هات؟

گەر تەماشای بڕیارەکەی دادگا بکرێت کە بووە هۆی لە کار خستنی ئەربەکان هۆیەکی تریش هەبوو بۆ ئەم مەسەلەیە، ئەربەکان تەمەنی گەیشتبووە (٧١)ساڵ، هاوکات لە گەڵ دەرچوونی بڕیارەکەدا. زانای کۆمەڵناسی تورکی پرۆفیسۆر (سەنقەر ئەیاتا) دەڵێ: بزووتنەوەی ئیسلامیی چاکترین یاریزانی لە دەست چوو ئەویش ئەربەکان بوو وە دوای ئەمە بێگومان ناکۆکی و ناهەمواری لە ناو سیستەمەکەیدا پەیدا بوو. وە بەدڵنیاییشەوە دوورکەوتنەوەی ئەربەکان بۆ گرتنەوەی جێگاکەی و بوون بە خەلافەتی ئەو ئاژاوە پەیدا بوو لە ناو بزووتنەوەکەدا وە لە دوای قەدەغە بوونی حیزبی ڕەفا هەڵوێستی ئیسلامیەکان بەرەو ئیجابی بوون دەڕۆی پاش ئەو گۆڕانەی بە سەریان هات حیزبێکی ئیسلامیی تازەیان دروست کردو ناوی (فەزیلەت) یان لێنا، جەنگی خەلافەتی ئەربەکان دەستی پێکرد لە نێوان دوو کۆمەڵی ناو بزووتنەوەکە، کۆمەڵی یەکەم پێکهاتبوون لە گەنج و لاوەکان و لایەنگیریان لە دوو سەرکردەی تازە پێگەیشتوو دەکرد ئەوانیش (رجب طیب ئەردوغان و عبداللە گوڵ و بلند ئەرینج) بوون کۆمەڵەی دووەمیان سەرکردە بە تەمەنەکان بوون لە دامەزراندنی حیزبی ڕەفاوە لە گەڵ ئەربەکان دا بوون وەك (ڕەجایی قۆتان، شوکت قازان، سلێمان عارف، فهیم ئاراك) بەڵام لە ڕاستیدا بزووتنەوەی ئیسلامیی نەیئەتوانی یەکێکی وەك ئەربەکانی دەست کەوێ وە حیزبەکەی کۆ بکاتەوە بە تایبەتی لە ناوەندێکی ئاوادا بە دامەزراوی سەربازی ستراتیجیو دامەزراوە عیلمانیەکان دەورە درابوون و دەیان ویست:

١- کۆتایی بهێنن بە ئیسلامییە سیاسییەکان کە حیزبی رەفا پێشڕەویان بوو وە دور خستنەوەی هێما ئیسلامییەکان وەك ئەربەکان و هاوەڵەکانی لە گۆڕەپانە سیاسیەکە.

٢- رێگا نەدەن لە ژێر ناوێکی تازەدا جارێکی تر خۆیان بکەنەوە بە ناو پەرلەمان دا.

٣- گەڕانەوەی تورکیا بۆ زەمەنی ئەتاتورك و ساڵی ١٩٣٨، مانای ئیسلام ئاینێك بێ لە چوارچێوەی ژیانی تاکە کەس زیاتر نەچێتە دەرەوەو نەچێتە قالبی هێماکان و قوتابخانەو فەرمانگە رەسمییەکان و بەرنامە سیاسییەکانەوە.

ئەم ستراتیجییەتە بەشێك بوو لە داواکارییەکانی سوپاو ئەمەش بووە هۆی هێنانەوە کایەی قەیرانێك لە نێوان یەڵمازو سوپا، مەسعود یڵماز دوو جار لە روون کردنەوەکانیدا ئاماژەی بەوە کرد بەرەنگار بوونەوەی شەپۆلە ئایینیە توندرەوەکان لە ئەستۆی حکومەت دایەو لە ئەستۆی سوپادا نییە، ئەوان کاری تر زۆرە بیکەن با بچن کارەکانی خۆیان لە مەسەلەی قوبرس و باشوری رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و دەریای ئیجەدا جێبەجێ کەن ئەو کاتەی یڵماز ئەم روون کردنەوەیەی پێشکەش کرد وەفدێك لە گەورە ئەفسەران پێکهاتبوون و بە سەرۆکایەتی (ئیسماعیل حەقی قارەدای) خۆیان گەیاندە لای یڵماز داوایان لێکرد بە هەر شێوەیەك بێت بەرەنگاری ئیسلامییەکان بێتەوە، بەڵام سەردانەکەیان بۆلای یڵماز هەموو شتێك نەبوو بۆ سوپا، خۆیان بە ناوی سەرکردایەتی هێزە سەربازییەکانەوە بەیانێکیان دەرکرد لە رێکەوتی ٢٠ مارتی ١٩٩٨دا، ناوەڕۆکی بەیانەکە دووپات کردنەوەی هەڵمەتی سوپا بوو بۆ سەر ئیسلامییە ئوسوڵییەکانی ناو وولات.

وە یڵماز هیچ شتێکی پێنەبوو بیکات بۆ پاشگەز بوونەوە لە قسەکانی پێشووی خۆی، ناچار رۆژێك دوای ئەمە لە رێگای تەلەفزیۆنەوە پیاوە سەربازییەکانی ئاگادار کردەوە کە کاری پێویست ئەنجام دەن ووتی (ئەفسەرەکان مافی خۆیانە

رووبەڕووی ئوسوڵی‌یەکان ببنەوە من ڕێگر نیم لەو کارانە گەر ئەوان بیکەن) پاش ئەمەش رۆژی ٢٣ مارتی ١٩٩٨ بە پێی داخوازی‌یەکانی سوپا چەند ئاگاداری‌یەکی بڵاوکردەوە کە بریتی بوون لە:

- پێکەوە نانی دەزگایەك بە مەبەستی چاودێری کردنی ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوو دامەزراوانەی گومانیان لێ‌ی هەیە، چاودێری کردن لە سەر پارەو پولی ئەم دامەزراوانە.
- قەدەغە کردنی ڕێکخستنە سیاسی‌یەکانی دژ بە عیلمانی‌یەت.
- چاو خشاندنەوە به یاسای تایبەت بە خۆپیشاندان.
- توند کردنەوەی سزاکان بۆ سەر ئەو کەسانەی پۆشاکی ئیسلامیی لە شوێنە حکومی‌یەکان دەپۆشن.
- قەدەغە کردن لە دروست کردنی مزگەوتی تازە، دەبێت مۆڵەت لە بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئایینی وەرگیرێت.
- دەرکردنی ئەو پۆلیسانەی لە ناو دەزگای پۆلیسدا چالاکی ئیسلامیی دەنوێنن.
- ڕێگرتن و مەرج دانان لە سەر کڕین و فرۆشتنی چەك.

ئەم لێپرسینەوەیەی یلماز پیاوە سەربازی‌یەکانی دڵنیا نەکردەوە چونکە ئەم یاسایانە کۆن بوون و وەزعەکەش پێویستی بە یاسای تازە هەبوو بۆ دانانی یاسای نوێ حکومەت پێویستی بە کاتێکی زۆرتر هەبوو لەگەڵ ئەوەشدا ئیرادەیەکی سیاسی یەکگرتوو نەبوو یاساکان جێ‌بەجێ بکا.

دامەزراوە سەربازیی‌یەکان خۆیان ڕێگایەکی تریان گرتە بەر بڕیارێکیان گەڵاڵە کرد بە دەرکردنی هەموو ئەو لێپرسراوانەی لە وەزیفە رەسمی‌یەکاندان بە تایبەتی وەزارەتی داد کە یەکێك لە پیاوە ناودارەکانی حیزبی رەفا دەیبرد بە ڕێوە ئەویش (شوکت قازان) بوو، ئەم بڕیارە جگە لە مانە (٣٧) حاکمی ولایەتەکانی گرتەوە لە کۆی (٨٠) حاکم، و (٢٠٠) بەڕێوەبەری پۆلیس بەر ئەم بڕیارە کەوتن.

وه لـه یـهكێك لــه كۆبوونــهوهكانی ئهنجومــهنی ئاسایشــی نهتــهوهیی داواكــرا چاودێرییـهكی زۆر توند و تیـژ بخرێتـه سـهر گروپهكـهی (فتــح الله گولــن) كــه خـهریكن رهگ و ریشــه دادهكوتــن و ئــهم گروپانــه دهگهڕانــهوه ســهر هــۆزی (نهورهسییهكان) وه گرنگییهكی زۆریان دهدا به فێركردن و بیرو را ئایینییهكان ،ئـهم گروپـه نفـوزی خـۆی لـه توركیــا بــلاو كردبـۆوه ئێسـتا خــاوهنی (١٠٣) قوتابخانهی تایبهتی خۆیانن كهبه قوتابخانه ههره باشهكانی وولات دهژمێردرێ، (٤٦٠) پۆلیـان ههیه قوتابیـانی قوتابخانـه ئامادهییـیهكان تیـایدا دهخوێنـن بـه مهبهستی وهرگرتنیان له زانكۆكان، (٥٠٠) خانوویان ههیه بۆ خزمهتی قوتابیان و خـاوهنی (٩٠) دامـهزراوو (٢١١) كۆمپانیـای بازرگـانیو كـهناڵێكی تهلــهفزیۆنی و رۆژنامهیهك و ١٤ گۆڤاریان ههیه، جگه له (٢) ئێزگهی رادیۆیی.

سوپا داوای كرد دهست به جـێ چاودێرییـهكی تـهواو بخرێتـه سـهر دارایـی ئـهم گروپـه كـاتێك بۆیـان روون بـووهوه داهـاتی سـالانهیان بریتییـه لـه (١٥) ملیـار دۆلار.

بۆ جێبهجێ كردنی ئهم بڕیارانه له كۆبوونهوهیهكی تری ئهنجوومــهنی ئاسایشـی نهتهوهیی پهیمان به مهسعود یهڵماز تازه كرایهوه كۆمهڵێك لێپرسراوی گهورهش بانگ كرابوون و ئهم ئهركهیان رووبهڕوو كرایهوه...

دهبێ بپرسین ئهم بڕیارانه جێبهجێ دهكرێت؟ گهر بڕیارێكی وا قورس جێبهجێ بكرێت ئاییندهی توركیا چی لێ بهسهر دێت؟

وه له راسـتیدا گـهر بڕیارهكـان سـهراپا جێبـهجێ بكرێـت ئهمـه مانـای نـهمان و بزربوونی ئیسلامیی سیاسییه له ژیـانی سیاسـی توركـیدا لـه دۆخێكـی ئاواشـدا دهبێت توركیا بگهڕێتهوه بۆ سالی ١٩٣٨ و ئیسلام بچێتهوه چوارچێـوهی ژیـانی تایبهتی كهسهكان لهوه زیاتر كاری پێ نهكرێت.

وه ئێمهش دهڵێین: نهك توركیا بـهڵكو كـام وولاتـی نـاو جیـهان رازی دهبێـت بـه سروشـت و مهرجـهكانی سـالی ١٩٣٨؟ یـاخود بـۆ جێبـهجێ كردنـی بڕیارهكــان دهبێت بیر له شتێكی تر بكرێتهوه ئهویش تهنها كودهتای سـهربازییه... دهبێـت

هەڵوێستەیەك بکەین، بلێین ئایا هیچ (دڵنیاییەك - ضمان) هەیە کودەتاکە بتوانێت زیندووبوونەوەو بە بەرداهاتنەوەی ئیسلامییەکان بوەستینێت؟

# تورکیا ... پاش (٧٥) ساڵ لە ڕێبازی ئەتاتورکی ..

پاش (٧٥) ساڵ لە ڕێڕەوی ئەتاتورکی، قەڵەمبازێکی وای بەخۆوە نەدی کەئاوات و خەونی چەند ساڵەی بوو، ئەو ڕێبازە ئەتاتورکییەی کە شانازیان پێوە دەکردو خواستەکانی خۆیانیان تیا دەبینیەوە وادەرنەچوو، بگرە بووە هۆی بەرەو هاتنە دواوە لە زۆر بوارداو ببوە مایەی (سوکایەتی - اهانە) پێکردنی دەوڵەتان، گەورەترین سوکایەتیش بە تورکیا کرابێ لە یادی ئاهەنگ گێڕانی تورکیا بوو بەبۆنەی تێپەڕ بوونی (٧٥) ساڵ بە سەر دامەزراندنی ئەتاتورکیدا، ڕەفزی بۆ هاتەوە لەبڕیاری وەرگرتنی یەکێتی ئەورووپا، کە چی پەیمان درابوو بە هەندێ دەوڵەتی وەك (پۆڵۆنیا و مەجەر و چیك و سلۆڤینیا و ئەستۆنیا) لە ساڵی ٢٠٠٠دا وەریانگرن بەو مەرجەی ئەم دەوڵەتانە زۆر لە دوای تورکیاوە و لە دوای ڕوخاندنی دیوارەکەی بەرلینەوە پێشنیاریان بەرزکرد بۆوە، بەڵام تورکیا لە ساڵی ١٩٨٧وە بە ڕەسمی خەریکی ئەم داوایە بووە، سووکایەتی پێکردنێکی تر بە تورکیا، بەستنەوەی مەسەلەی (قوبرس) بوو، کردیانە مەرجێك بۆوەرگرتن لە یەکێتی ئەورووپی گەر بڕوانینە تورکیا بە پێی پێوانە ئابووریو کۆمەڵایەتی‌یەکان و دوای (٧٥) ساڵ لە بەردەوام بوونی ئەتاتورکی‌یەت هێشتا نەچۆتە ڕیزی وڵاتە پێشکەوتووەکانەوە بە پێی ئەو دەست کەوتانەی کە هەیەتی، ساڵی ١٩٩٧ داهاتی کشتی ناوخۆی تورکیا گەیشتە (٢٠٠) ملیار دۆلار و ئابووری تورکیای خستە (١٦) هەمین وڵاتەوە، ڕێژەی دانیشتوانی شارەکان لە چاو ساڵی ١٩٢٣ بە ڕێژەی ٢٥٪ بوو گەیشتە لە ٦٥٪، تا ساڵی ١٩٩٧، وە ڕێژەی نەخوێندەواری دابەزی بۆ ١٠٪ وە ناوەندی داهاتی تاکە کەس ساڵانە لە (٣٠٠) دۆلار نەهاتە خوارێ، وە ئابووری بەشێك لە وڵات لە خوارووی

سالآنه له (٣٠٠) دۆلار نەهاتە خوارێ، وە ئابووری بەشێك لە وولآت لـە خـوارووی ڕۆژهەلآتی وولآتدا ئابووری‌یەکی نیمچە دەرەبەگایەتی‌یە لە گەلٚ ئەوەشدا داهاتی (نێردراوەکان - صادرات) گەیشتبووە ٢٦ ملیـار دۆلار تـا سـالٚی ١٩٩٧، وە هـەر ئەو ساڵە دەرامەتەکان بە گشـتی بریـتی بـوون لـە (٤٦) ملیـار دۆلار وە تێکـڕای هەلآوسان سالٚی ١٩٩٤ گەیشتبووە ١٢٤٪ وە سالٚی ١٩٩٨ ببـوو بـە ٩٩٪، کـورت هێنان لە بودجەی گشتی دەولّەت نزیك بوو لە (٨,٥٪) لە تێکـڕای بەرهەمـەکانی ناوخۆ، کەلّەکە بوونی قەرزەکانی دەرەوە لە ئاستی (٩٥) ملیار دۆلاردا بوو، واتە بە ڕێژەی ٤٨٪ لە داهاتی نەتەوەیی لە سالٚی ١٩٩٨دا، چەند سالٚێك لە مـەوپێش (٢٠٪)ی دانیشتوان لە چینی هەژارەکان بوون و لە کۆی داهاتـەکان (٣,٥٪) یـان بەرکەوت، وە ئێستا واتـە سـالٚی ١٩٩٨ لـە (٢٠٪)ی دانیشـتوان دەولّەمـەندن لـە کۆی داهاتەکان (٥٥٪) یان بەردەکەوێت. حکومـەتی مەرکـەزی و بیرۆکراتیـەکان زۆریان پەلە بوو لە (بەتایبەت کردنی) ئابووری وولآت و بە جیهانکردنی( عولمە).

تاکو سالٚی ١٩٩٧ نرخی ئەو کۆمپانیایانەی دەولّەت فرۆشتبووی و کردبوونـی بـە کەرتی تایبەت بایی (٣,٤) ملیار دۆلار بوو، ئەم ڕەفتارەی حکومـەت بـووە هـۆی جۆرێك لە فەسادو دروسـت کردنـی توێژێکـی ئولیگاریشـی، سـەرکردەکان تێکـڕا دەستیان هەبوو لەم کارانە کەوتبوونە بـەر لۆمـەی جـەماوەرو تـاوان خرایـە پـالٚ ئۆزال بە پێگەیاندنی هەندێ سەرمایەداری خوێن مژ وەك (صـابونچی و کوچـەك) هەروەها تانسۆ چیللەریش تاوانبار کرابوو بە کۆکردنـەوەی سـامان و نـاردنی بـۆ دەرەوەی وولآت جگە لەمەش مەسعود یەلماز ئاسان کاری کرد بوو بۆ فرۆشـتنی بانکێکی بازرگانی دەولّەت بە (عەلادین شاقچی) یەکێك بوو لە مافیـا گـەورەکانی تورکیا.

تورکیا بە تـەواوەتی ببـو بـە شـوێنی دروسـت کردنـی پـارەی سـاختە بـە پـیێ ڕاپۆرتی (د.مصطفی تۆریـن - بەڕێوەبـەری گشـتی سـەرژمێری و تۆمـار کـردن) تورکیا سالآنە (٥٠) ملیار دۆلاری دێتە دەست لەم کارە دزێوانە و ٣/١ ی داهـاتی تورکیا پێك دەهێنێـت، ئـەم سـەرمایەدارە هەلّتۆقیوانـە پێشـبڕکێیانە لـە کڕینـی

بانکەکان لە راپۆرتێکی (بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس)دا هاتووە لە مانگی حەوتی ساڵی ١٩٩٨دا دەرچووە دەڵێ: یەکێك لەو ڕێگایانەی پارەی ساختەی تیا سەرف دەکرێت بانکەکانی تورکیایە ، ئەو دەستبڕانە دەچن پارەیەکی زۆر بەقەرز لە بانکەکان وەردەگرن و پاش ماوەیەك پارەی ساختەیان بۆ دەبەنەوە.

بە پێودانگێکی سیاسی بڕوانینە وولاتی تورکیا، دەبێ بڵێین وولاتێکی نادیموکراتیە، مافەکانی مرۆڤ لە بەرچاو ناگیرێ گەر لە روانگەیەکی ئەوروپییەوە تەماشاکەین هەر چەندە سیستەمی فرە حیزبی پەیڕەو دەکرێت و دەسەڵاتی حوکم لە نێوان حیزبە جیاجیاکاندا ئاڵوگۆڕ پێ دەکرێت، بەڵام تائێستا حوکم لە دەسەڵاتی سەربازی نەسێندراوەتەوە بەڵکو ئەمان چارەنووسی ئیئتلافەکان دیاری دەکەن.

Ataturk

دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت کودەتای سەربازی لە لایەن ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپییەوە ناشایستە و ناپەسەندە، پیاوە سەربازییەکان شێوازێکی تریان بە کارهێنا ئەویش خۆ فەرز کردنیان بوو لە ناوەندە گرنگ و پڕپایەخەکاندا، بۆ نموونە پلەی سەرۆك کۆماریان گرتە دەست خۆیان، وەسەرۆکی حکومەت و سیاسەتی دەرەوەو ناوەوەشیان لە رێگای ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە خستە ژێر دەستی خۆیان، هەر وەها لە حاڵەتە چارەنووس سازەکاندا هەر خۆیان بە پلەی یەکەم بڕیاردەری سەرەکین وەك هەڕەشە کردنیان لە سوریاو بەرپاکردنی جەنگ لە دژیان یا کردەوە سەربازییەکانی لە دژی PKK دەکرێت و پەیمانە ستراتیجییەکانی خۆیان و ئیسرائیل وە ٣/١ی بودجەی دەوڵەتیان بۆ خۆیان دابین کردووە بە ناوی (بەرگری کردن لە وولات)ەوە.

لە پێشێل کردنەکانی مافی مرۆڤ دەبینین ناوچە کوردنشینەکان زۆربەی کات حاڵەتی نائاسیی تیا فەرز دەکرێت کوشتن و ئەشکەنجەو دەرکردن و سوتاندنی

خانووبەرەكان بۆتە كارێكی رۆژانەو (١٥) ساڵە بەردەوامە لە كام جێگای توركیا چەند كەسێك بەند نەكراوە بە تاوانی جیابوونەوە یان ئوسولیەت یا شێواندنی دەوڵەتی عیلمانی ئەتاتورك؟

رۆژی ١٢ی مایسی ١٩٩٨ لە نووسینگەكەی خۆی چەند چەكدارێك تەقەیان لە (ئەكین بیردال)كرد كە سەرۆكی كۆمەڵەی مافەكانی مرۆڤ بوو، تەنها لەبەر دەربڕینی هاوسۆزی خۆی بۆ كوردەكان ، ئەمە وای لێكرد بڵێ توركیا دووچاری جەنگێكی بەردەوام بۆتەوە لە نێوان نەتەوەكان و بیرە جیاجیاكان وە چەك جێگای یاسای گرتۆتەوە. هەر لە یادی تێپەڕبوونی (٧٥) ساڵەی دروست بوونی ئەتاتوركی‌یەت، (٥٠) كەس بوونە قوربانی لە ناو زیندانەكانی توركیا بە هۆی مانگرتنیانەوە وە هەر ئێستاش زیندانەكانی توركیا زیاتر لە (٦٠) هەزار زیندانی تیا بەند كراوە بەتۆمەتی سیاسی بوونیان و لەمافە سەرەتاییەكانی ئینسان بێبەشیان كردوون، هەر لەو یادەدا بەرامبەر جوڵاندنەوەی كوردی ئەمجارە توركیا زیاتر خۆی توندتر كردووە لە ژێر فشارو هەڕەشەو گوڕەشەیەكی زۆردا سوریا ناچار كرا رێكەوتنێك لە گەڵ توركیا ئیمزا بكات خاڵێكی گرنكی رێكەوتنامەكە دەست هەڵگرتن بوو لە یارمەتی دانی ( PKK) دەركردنی سەرۆك (عبدالله ئۆجەلان) لە خاكی‌سوریا، پاش ئەمە حاڵەتی نائاسایی لە شەش ناوچەی كوردی راگەیەندرا. ئەویش (دیاربكرو هەكاری و سیبرت و شەرناخ و تەنجەلی و وان) بوو هەر لەو ساتانەشدا هێرش كرایە سەر PKK لە باكوری عێراق. بە پێی زانیاری‌یەكانی تورك (ئۆجەلان) پاش بە جێهێشتنی سوریا خۆی گەیاندۆتە ناوچەكانی ژێر دەسەلاتی یەكێتی‌ی نیشتمانی‌ی كوردستان لە باكوری عێراق. دوای ئەمە سوپا دەستی كرد بە جوڵاندنی هێزەكانی بەرەو ناوچەی تونجەلی، بەهۆی تەقینەوەی مینێك لە ژێر زرێپۆشێكدا چوار سەربازی توركی بریندار بوون یەكێكیان ئەفسەر بوو، شەڕو پێكدادانی خوێناوی تەواوی ناوچەكەی گرتەوە..

مانگی ٩ی ١٩٨٨ ئۆجەلان یەك لایەنە بڕیاری راگرتنی شەڕی راگەیاند مانگێك دوای ئەمە سوریای بەجێهێشت و دەست پێشكەری‌یەكی خۆی پێشكەش كرد بۆ

رێگا چارەی کێشەی کوردی بە رێگای گفت و گۆو هێمنانە لە سەر بناغەی فیدرالیەتی تورکی بە مەرجێك تورکیا دان بە مافەکانی (٢٠) ملیۆن کوردا بنێت، بەڵام تورکیا هیچ ئاوڕدانەوەیەکی ئیجابی بەرامبەر بەم هەڵوێستە نە بوو دەسکەوتەکانی میللەتی کوردی خستە خانەی نەبوونەوە، لە جیاتی ئەمە داوای گرتنی (ئۆجەلان)ی دەکرد وەك تاوانبارێکی جەنگ، سوپا هیچ ئیعتبارێکی سیاسی بۆ دانەنا سوپا بە بیر کردنەوەی خۆی (حیزبی دیموکراتی گەلی _هادەپ) ی دانابوو بە ئەلتەرناتیڤ لە بری ( PKK). پێی وابوو (هادەپ) دوژمنایەتی حکومەتی تورکی ناکات و دوورە لە خەباتی چەکداری. کەچی لە دواییشدا حیزبی (هادەسپ) ی داخست و سەرکردەکانیشی فڕێدانە زیندانەوە هەر لە یادی دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیا حوکمی بەند کردن درا بەسەر (حسن جلال غۆزیل) سەرۆکی حیزبی (صحوە) بە تاوانی سەرکردایەتی کردنی ئیسلامیەکان و رێگری لە دەست تێوەردانی سوپا.

هەر لەم یادەدا بابەتێکی گرنگ مابوو، وە سەرقاڵی کردبوون نەیاندەزانی چۆن هەڵس و کەوت بکەن لە گەڵ حیزبی فەزیلەت چونکە ئەمان زۆر میانرەوبوون خەباتگێرێکی بە ئەزموون بوون، ئەترسان لەوەی ئەم ئیسلامیانە بگەڕێنەوە سەر حوکم. سەرۆکە گەنجەکانی ناو حیزب کە (عبدالله گوڵ) یەکێك بوو لەو سەرکردانە وازی لە بیرۆکەی (سیستەمی دادپەروەری) هێناو لەبەر نامەکەیدا نەیهێشت، حیزبی رەفا خاوەنی ئەم بیرۆکەیە بوون و دژایەتی سیستەمی عیلمانییان پێدەکرد، لە جیاتی ئەمە ئایدۆلۆجیەتێکی تازەیان هێنایە بەرهەم تا لەگەڵ سیستەمی ئێستا بگونجێ، واشیان لە حیزبەکەی خۆیان کرد بیرو باوەڕە چەپەکان و بیرە کۆمەلایەتیەکانی تر بە سنگێکی فراوانەوە وەرگرن ئەم رەوتە وای لە (رجائی قوتان) کرد سەرۆکی بە تەمەنی حیزبی (فەزیلەت) لە هەموویان زیاتر لیبرالی و میانرەوتر بێت، لە ووتارێکیدا لە بەردەم (یەکێتی یە پیشەوەرەکان)دا ووتی (حیزبمان پشتگیری لە ئابووری ئازاد و کەرتە تایبەتەکان و عیلمانیەت و دیموکراتی دەکات بەم سیاسەتە کۆماری دیموکراتی

دەپـارێزرێت، ئێسـتاش هـێزێك نـابینین بەدەسـەلاّت تـر بێـت لـە ئیسـلامی‌یە رادیکالەکان، کارەکانی حیزبی رەفاش ئێستا حیزبی فەزیلەت تـەواوی دەکـات و بە پێویستی‌یەکی خۆی دەزانیّ)
دیبلۆماسی‌یەکی سەر بە رۆژئاوا کە لە ئەنقەرە دانیشتنم لـە گـەڵدا کردبـوو بـۆی روون کردمەوەو ووتی بە پیّی هەڵسەنگاندنەکانی ئێمـە لـە سـاڵی ١٩٩٩ حـیزبی فەزیلـەت لـە هـەڵبژاردندا لـە ٣٠٪ دەنگـەکان بـە دەسـت دەهێنـیّ وە لـە وانەیـە (عبـدالله گـوّل) خــۆی بەمــە رازی نــەبێت چونکــە رێژەیــەکی وا تووشــی رووبەڕووبوونەوەو قەیرانیان دەکات لـە گـەڵ سـوپا تـاکو کارەسـاتێکی وەك ٢٨ شوباتی ١٩٩٧ دووبارە نەبێتەوە کە بە هەڵوەشـاندنەوەی حـیزبی رەفـا کۆتـایی هات. هەر وەها یەکێکی تر بـە نـاوی (فـورال سـافاس) پـیّی راگـەیاندن حـیزبی فەزیلەت گەر لە (٩٩,٩٩٪) ی دەنگەکانیش بە دەست بێنن هەر ناتوانن کورسـی دسەلاّت وەرگرن چونکە سوپا نایەڵێت.
پوختەی باسەکەش سوپای تورکیا لەم یادەدا دوو دەستکەوتی بەدەست هێناوە بـەرپا کردنـی جـەنگ لـە دژی کوردەکــان و لــە دژی ئیسـلامی‌یەکان کەوتۆتــە جەنگێکەوە لە گەڵ نیوەی دانیشتوانی تورکیا، واتا بە هۆی سیاسـەتەکانیانەوە نیوەی دانیشتوانی تورکیا بەرانبەر نیوەکـەی تـر دەجـەگن، جـەنگی (گـەڕان بـە دوای خود) دا میللەتیان دابەش کردووە بە سەر داگیر کەر و داگـیر کـراودا بـەلاّم داگیرکەر هەر گیز بە داگیر کەری نامێنێتەوە.

# گەشتێك لە دەروازەی ئەسکەندەرونە و کوردستانەوە

**هێڵەکانی بەرەنگار بوونەوەی تورکی - سوری :**

ساڵی ١٩٩٨ لە شاری (ئەدەنە)ی تورکی رێکەوتنێك لە نێوان تورکیـا و سوریا مۆر کـرا سـەبارەت بـە ئاسایشـی ناوچەکـەو پەیوەندی‌یـەکانی هـەردوولاو زیاتر جەخت کرایـە سـەر دەسـت هـەڵگرتن لـە یارمەتیـەکانی سـوریا بەرامبـەر (

P.K.K) ، تاکو ساڵی ۱۹۹۸ مەسەلەی کوردی نەبووبوو بە مایەی کێشەکانی نێوان سوریاو تورکیا بەڵکو هەر لە زووەوە لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی تورکیاو هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی کێشەکان درووست بوون وەك کێشەی (زەوی و دانیشتوان و ئاو)، تورکیا کێشەکانی لە گەڵ سوریا گەیاندە رادەی تەقینەوەو کۆکردنەوەی سوپا لە سەر سنوورەکەی مەسەلەی کوردیشی کردە خاڵێکی گرنگی ناو کێشەکە، لە راستیدا ئەم هەڕەشە توندو تۆڵەی تورکیا لە لاوازی سوریاوە سەرچاوەی گرت کاتێك تورکیا دەیبینی کە سوریا وولاتێکی دەست کورت و بێ هێزە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، وە سوریا سوێند خۆری یەکێتی سۆڤێتی جاران بوو وە ئێستا لێکەوتووەو ئەو هاوڕێ مەزنەی جارانی لە کیس چووە، سوێندخۆرەکانی ئێستاشی تەنها بریتین لە ( ئێران)، لە گەڵ ئەوەشدا تورکیا شانازی بە رێکەوتننامەکەی خۆی و ئیسرائیلەوە دەکرد، بووە هاندەرێك بۆ هەڵکوتانە سەر سوریا، بەلاّم ئایا بۆ تورکیا پەنای بردە بەر هێز؟ مانۆڕە سەربازیەکی تورکیا لە بەرامبەر سوریا پەیوەندی هەبوو بە رووداوە ئیقلیمیەکانی دەرەوە گرنگترینی:

۱-میوان داری کردنەکەی هەردوو سەرکردەی کوردی مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لە لایەن واشنتۆنەوە ترسێك بوو لە سەر تورکیا بۆ دروست بوونی دەوڵەتی کوردی لە باکوری عێراق.

۲-میوان داری کردنی پەرلەمانی ئیتالی بۆ کۆبوونەوەی پەرلەمانی پارتی کرێکارانی کوردستان لە دەرەوە ئەمەش مانای مامەڵە کردنی یەکێتی ئەوروپایە لە گەڵ حیزبەکەی ئۆجەلان وەك قەوارەیەکی سیاسی تەماشای بکەن.

پرۆفیسۆر (سیفی چان) سەرۆکی پەیمانگای سیاسەتی دەرەوەی تورکیا دەڵێت: سیاسەتی دەرەوەی تورکیا بەبە کارهێنانی هێز شێوازی خۆی گۆڕیوە لە دوای وەرنەگرتنی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپیەوە ئەمە رووی‌دا، ئەو چاوەڕوانی‌یە

زۆره توركیای بێزار كرد له چوونه ناوەوەی ئـەورووپی و هیـوای جـارانی پێنـەما، ناچـار دامـەزراوه سـەربازی‌یەكان پـەنایان بـۆ هـێز دەبـرد بـۆ یەكالاكردنـەوەی كێشەكانیان لەگەڵ ئەمەشدا مەرجی سەرەكی بۆ وەرگرتنـی توركیـا لـە یـەكێتی ئەورووپا دوور كەوتنەوە بوو له كاری سەربازی و داپلۆسین، وە سوریای هەڕەشه لێكراویش داوای بەشی خۆی دەكرد له ئاوی فـورات، توركیـاش لـە چوارچێـوەی پـڕۆژەی خـوارووی رۆژهـەلاتی ئـەنادوڵ (گـاپ) بـۆ گەشـە پێدانـی ناوچـە كوردی‌یەكان بەربەستێكی بە ناوی (بیرجیك) دروست كردبوو نیوەی ئاوی فراتـی گل ئەدایەوە، هەروەها توركیا بیری له ناردنه دەرەوەی ئاو كردبۆوە له بەرامبەر هێنانی پترۆڵدا به پێی ئەو رێكەوتنەی له گەڵ وولاتەكانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا به ستبوی.

وه رێژەی مۆڵ بوونەوەی ئاوی فرات (١٠٠٠) م٣ له چركەیەكدایه بـۆ سـاڵێك. وه بەشی هەر یەك له سوریا و عێراق (٧٠٠) م٣ یـه لـه چركەیـەكدا بـەلام ئێسـتا بـه هەردوو وولاته عەرەبی‌یەكه (٥٠٠) م٣ یان بـەر دەكـەوێت. وه سـوریاش هـاواری لێبەرزبۆوه داوای دابەشكردنی ئاوەكەی دەكرد به شێوەیەكی یەكسـان.حـاڵێكی تری هەڕەشەكانی توركیا بۆ سـەر سـوریا و لیـوای ئەسـكەندەرۆنه بـوو، توركیـا دەیویست ئەم لیوایه له بیر سوریا بەرێتەوە...

گەر بێینه سەر كورته باسێكی شاری (ئەسـكەندەرۆنه)، دەبێـت بگەڕێینـەوه بـۆ دوای جەنگی جیهانی یەكەم و ڕووخانی ئیمپراتۆری‌یەتی عوسمانی لـەدوای ئـەم ڕوداوانـەوه سـوریا سـاڵی ١٩٢١ كەوتـە ژێـر ئینتیدابـی فەڕەنسـاوه، لیـوای ئەسكەندەرۆنەش به تەواوەتی له ژێر ئـەم ئینتیدابـه دابـوو، بەشێكیش بـوو لـه سوریا، له پەیمانی (لۆزان)دا ساڵی ١٩٣٦ وێنەی سنووری توركیا تـازه كرایـەوه توركیـا بڕیـاری‌دا واز لـه هـەموو مافـەكانی ناوچـەی باشـووری سـنوور بـهێنێت (ئەسكەندەرۆنه)ش بەشێك بوو لـەو سنووره. لەسـاڵی ١٩٣٦دا فەڕەنسی‌یەكان

سەربەخۆییان بەخشیە سوریا. وولاتی سوریا (٩) پارێزگای تیا دروست بوو لیوای ئەسکەندەرۆنەش بەشێك بوو لەم شارانە، ئەمە بووە مایەی رق هەستانی تورکیاو داوای ئەم لیوایەی دەکردەوە. ئەم مەسەلەیە هەلگیرا بۆ بەردەم (کۆمەڵەی گەلان - عصبة الامم) ساڵی ١٩٣٧ .

بڕیاردرا سیستەمێکی تایبەت بە لیوای ئەسکەندەرونە دانێن، کاروباری ناوخۆی لیواکە سوریا بیبات بەڕێوە،بەڵام پاراستن و بەرگریکردن لەداگیرکەران دەبێت لە ئەستۆی تورکیادا بێت. وە لە ساڵی ١٩٣٩ هاووڵاتیەکانی لیواکە ڕەگەزنامەی تورکیان پێدرا، دوای ئەمە بەتەواوەتی لکێنرا بە تورکیاوە. ئەم هەڵوێستە کتوپڕەی فەرەنسا بۆ تورکیا لەبەر ئەوە بوو فەرەنسا دەیووست تورکیا بەلای خۆیدا ڕاکێشێت لەدژی ئەڵمانیا بیکاتە سوێندخۆرێکی خۆی وە دەیزانی تورکیا بەپێی پێگە جوگرافیەکەی چەند بەندەرێکی باشی هەیەو سوودیان لێ دەبینێت.

شاری ئەسکەندرونە، ئەسکەندری گەورە بنیاتی نا لەدوای جەنگی (ئەسیوس) ساڵی ٣٣٣ی پێش زاین، وە لەسەردەمی عوسمانیەکانیدا بووە مەڵبەندێکی بازرگانی حەلەب و جەزیرەو وولاتی فارس وە ئێستا بەندەرێکی بازرگانیە، شارێکی پیشەسازیەو بنکەیەکی سەربازیشە، ئەم شارە وەك داب و نەریت و کولتورو زمان و ڕۆشنبیریان هێشتا عەرەبیە، زمانی یەکەمی ئاخاوتنیان عەرەبیە هەرچەندە کەوتۆتە سەر کەنارەکانی تورکیا. ئەوەی کەمن بینیم لە دانیشتوانی شارەکە و قسەم لەگەڵدا دەکردن باسیان لەوە دەکرد لەماڵەکاندا بەزمانی عەرەبی قسە دەکەن و لەناو بازاڕو شوێنە گشتیەکانیشدا تەنها لە خوێندنگاکاندا بەزمانی تورکی دەخوێنرێ.

ئایا دانیشتوانی شارەکە خۆیان بە تورك دەزانن یا بەسووری؟ وەڵامەکەش لای خۆیانە و دەڵێن خۆمان بە عەرەب دەزانین بەڵام هاووڵاتیەکی تورکین.

ئەنتاکیا کە پایتەختی ئەسکەندەرونەیە، کاتێك چومە ناو ئەنتاکیاو پرسیارم لەیەکێك لە هاووڵاتیان کرد، پێی ووتم زۆربەی دانیشتوان بە بازرگانیەوە خەریکن بەڵام ڕێژەی بێکاران زۆرە ئاستی خوێندەواریش کزە.

هاوڕێیەكی تریش بۆی ڕوون كردمەوە چەند جارێك لێرە یاخی بوون و نائارامی ڕوویداوە ساڵی ١٩٨٩ سوریا فڕۆكەیەكی سیخوری توركی خستە خوارەوە بەڵام ئێستا بارودۆخ ئارامە. عەرەبەكانی ناو ئەنتاكیا بەپێی ئەو مۆركە عەرەبیانەی هەیانەبەختەوەرن بەو ژیانەی لە ئازادیو لایەنی ئایینی و گوزەران دا،بەسەری دەبەن بەبەراوردكردنی خزم و كەسەكانیان كەلە سوریا دەژین. عەرەبەكانی ئەنتاكیا كۆكن لەسەر ڕێزگرتنی ئەتاتورك، زۆر بەیان لە شیعەكانن (عەلەوی)، عەلمانیەتی ئەتاتورك جۆرە یەكسانیەكی بۆ دروست كردوون لەگەڵ سوونیەكاندا، ئەوانیش وای دەبینن ئەتاتورك دروست كەری دەوڵەتی توركیای نوێیەوە پێیان وایە (عبدالله ئوجلان) عەرەبێكی ئەنتاكیایە وەپیان ناخۆشە كوڕەكانیان بچنە شەڕەوە وەدەڵێن موسڵمان نابێت موسڵمان بكوژێت.

# كوردستان ... خاكێكی سووتاو

نووسەری بەناوبانگ (یەشار كەمال) دەڵێت : (لەوانەیە ئەنقەرە بتوانێت دەریاكان ووشك بكات، بەڵام هیچ ماسیەكی بۆ ناگیرێت) كاتێك گەیشتینە شاری دیار بەكر پایتەختی كوردستانی توركیا گوێبیستی هەواڵێك بووم یەكێك لە ئەندامەكانی پارتی كرێكارانی كوردستان یەكێك لە فڕۆكەكانی فڕۆكە خانەی (ئەدەنە)ی ڕفاندووە كەڕێكەوتی ٣٠ی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٩٨بوو، بیرم كردەوە كە بگەڕێمەوە بۆ ئەنقەرە نەوەك تووشی گرتنبم و چونكە ڕێگا نادەن بە بێگانەو ڕۆژنامەنووسان و تەنانەت توركەكان خۆشیان نزیك ئەو شوێنە بنەوە، بەڵام بۆ زیاتر زانین و لێكۆڵینەوەكانم وام بە چاك زانی بەردەوام بم لە گەشتەكەم هەتا زاخۆ كە دەكەوێتە سنووری عێراقەوە كاتێك لە ئەنتاكیا بووم و بەرەو دیاربەكر كەوتمە ڕێ پاش سێ كات ژمێر گەیشتمە شاری (غازی عەنتیب) دوای ئەمەش گەیشتمە شوێنێكی تر پێیان دەگوت (ئورفە) هەر لەیەكەم سەرنجم دا بۆم دەركەوت كە شارێكی كوردیە لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دانیشتوانەكەی بەرگی كوردیان لەبەر دابوو، بەپێی سەرچاوە ئیسلامیو

یەهودیەكان، پێغەمبەر (ابراهیم خەلیل - سڵاوی خوای لەسەر بێت) لە ئورفە ژیاوە لێرەوە زانیاری و پەیامی خوای بڵاوكردۆتەوە پاشان گواستراوەتەوە بۆ فەلەستین، وە لە ئورفەی كۆن ئەشكەوتێك هەیە پێی دەڵێن ئەشكەوتی ئیبراهیم خەلیل وە لەو ئەشكەوتەدا سەرداری گەورەمان ابراهیم لەدایك بووە وە دەریاچەیەك هەیە بەناوی دەریاچەی ابراهیم دەریاچەیەكی پیرۆزەو ڕاوە ماسی تیا دەكرێت.

پاش بەجێ هێشتنی شاری ئورفە چوار كات ژمێری ترم بە ئوتۆمبیل بڕی گەیشتمە شاری (ماردین) و پاش دابەزینمان بینیم چەند منداڵێكی كورد نانیان دەفرۆشت جل دڕاوو پێیان پەتی، هاوەڵەكەم كە كورد بوو پێی ووتم ئەمانە منالی كوردن بەڵام منداڵانی تورك ئێستا لە باوەشی دایكیاندا خەوتوون، گەر ئێستا كورد دەوڵەت بووایە، دەوڵەمەندترین وولاتی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەبوو.پاشان تەماشام كرد خەڵكانی شارەكە بەكوردی قسە دەكەن و خەڵكی عەرەبیش تێكەلاویان بوو بوون، هاوەڵەكەم پێی ووتم ساڵی ١٩٩٠ كوردەكان و ئیسلامە ئوسولیەكان بەیەكەوە خەباتیان دەكرد لەدژی توركەكان ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هێزێكی زۆری سەربازیو ئەمنی لەناوچەكەدا كۆبێتەوە، بەهۆی بەرزی ماردین لەسەر ئاستی دەریاوە كراوەتە بنكەیەكی سەربازی لەدژی كوردەكان و سوریا، دوای دوو كاتژمێری تر بە ئوتومبیل ڕۆیشتین تا گەیشتینە شاری (دیاربەكر) و لەشارە گرنگەكانی كوردستان دەژمێردرێت هەر لەیەكەم ساتەوە ڕوانیم هێزێكی سەربازی زۆری لێیەو ناوچەكە لە گۆڕەپانی جەنگ دەچوو، پاش (٧٠) ساڵ هێشتا شەڕ نەوەستاوە لەنێوان تورك و كوردەكان، پاش كۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی یەكەم، ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لێك هەڵوەشا هیوا تێك شكاوەكانی كورد جارێكی تر گەشایەوە، بڕیارێكی تازە دەركراو لە (١٤) خاڵ پێك هاتبوو سەرۆكی ئەمەریكی (ویلسن) پشتگیری لێكرد و پەیمان درا مافی ئۆتۆنۆمی بدرێتە كورد لە پەیمانی سیڤەردا ساڵی ١٩٢٠ سەڵتەنەی عوسمانی پەیمانیدا مافەكانی كورد بسەلمێنێ بەپێی مادەی (٦٢)

له پەیمانەكە بەسەرپەرشتی لیژنەیەكی دەولی ناوچەیـەكی كوردی لـه خـوارووی توركیا دروست بكرێت لەژێر سایەی ئۆتۆنۆمی‌داو مصطفی ئـەتاتورك بـەرەنگاری ئەم پەیمانە بووەوەو فێڵی له كوردەكان كرد تا لەگەڵ خۆیدا بن، خـۆی هـەموو شتێكیان بۆ دەكات. وە كوردەكانی چەكدار كردو كردنـی بەسـەرباز لـەریزەكانی سوپای توركیادا تاكو بەگژ هێزەكانی فەرەنساو یۆناندا بچنەوە ئەو كاتە بەشێك له رۆژئاوای توركیایان داگیركرد بـوو. وە شـەڕی ئەرمەنـەكانی پێكـردن، پاشـان ئـەتاتورك خـۆی لـــه كوردەكـــان هەڵگەڕایـــەوە، ڕەهـــەندە نەتەوەییـــەكانی تیكشكاندن.

پاشـان پـەیمانی لـۆزان هاتـه پێشـەوە بـۆدان پیانـانی دەوڵـەتی توركـی لەسـەر پاشماوەی ئێسك و پروسكی كوردەكان، ئەتاتورك هەسـتا بـه هەڵوەشـاندنەوەی خەلافەتی ئیسلامی، كەسیاسەتێكی یەكگرتوو له تـورك و كـوردو موسـڵمانەكانی تـر نوێنەرایـەتیان ئـەكرد، هـەموو جـۆرە مـافێكی لـه كوردەكـان قەدەغـه كـرد، قسەكردن بەزمانی كوردی، جل و بـەرگی كـوردی، چاپ و چاپەمـەنی، دەسـتەو تاقم و كۆمەڵە كوردیەكان...

كوردەكـانی دیـار بـەكر قەسـابخانەكەی سـاڵی (١٩٢٥)یـان لەیادنـــەچوو بـۆوە، دەوڵەتـه تازەكـەی ئـەتاتورك ئـــەو ســاڵە لـــەدژی كوردەكـان كردبـووی، ئـــەم تریاژیدیایه لەشاری (دەرسیم) ئێستا پێـی دەڵێـن (تونجلـی) ڕوویـدا، لـەكاتێكدا شێخ سەعید شۆڕشی هەڵگیرساندو هەموو كوردستانی گرتەوە، ئەتاتوركیش زۆر دڕندانه ڕووبەڕوویان وەستایەوەو هـێزە توركیـەكان بەسـەدەها دێهاتیان وێـران كردو سووتانیان وە نزیكەی چارەكه ملیۆنێك كوردیان لەناو بردو شـێخ سـەعیدو دارو دەستەكەشی لەبەرچاوی خەڵكی‌دا بەپـەتی سێدارەوە هەڵواسـران هـەتاكو ساڵی ١٩٣٨و مردنی ئەتاتورك چۆڵ كردن و ڕاگواستنی دیهاتەكان بەردەوام بـوو بەرەو رۆژئاوای ئەنادۆڵ ڕایان دەگواستن.

سـەیر لەوەدایـه ئـەو كەسـەی سـەركردایەتی هەڵمەتـه سـەربازیەكانی ناوچـەی دەرسیمی دەكـرد (عصمـت ئینۆنـو) بـوو كابرایـەكی كـورد بـوو دەم ڕاســت و

یاریدەدەری یەکەمی ئەتاتورك بوو، هەمیشە کوردەکانی ئاگادار دەکردەوەو دەیووت (لەنەتەوەی تورك زیاتر هیچ نەتەوەیەکی تر بۆی نیە داوای مافە نەتەوایەتیەکانی خۆی بکات) وە لەم شارەدا وەك بۆم دەرکەوت لەدوای شۆڕشی شێخ سەعیدەوە شۆڕش کۆتایی نەهاتووە لەساڵی ١٩٨٤ وە زنجیرەیەك هێرشی چەکدارانە لەلایەن (P.K.K) وە کراوەتە سەردام و دەزگا تورکیەکان. دێهات و ناوچەکانی دەوروبەری بەتەواوەتی وێران کرابوون و خەڵکەکەشیان کۆچ پێکرابوو. وەزیری دەوڵەتی تورکی نەیتوانیوە نکۆڵی لەم کارەساتانە بکات و وتی چەکدارەکانی (P.K.K) لەم ناوچانە هەڵدەستن بەکاری تیروریستانە وبۆ ئەوەی شاری (تونجلی)یش نەبێتە مەڵبەندێك بۆ ئەم جۆرە کارانە دەوڵەتی تورکی خۆی کۆچی بەجوتیارانەکان کردو دێهاتەکانی سووتاندون. لەساڵی (١٩٩٥) دەوڵەتی تورکی (٤٠٠٠)قوتابخانەی لەم ناوچانەدا داخستووە بەهۆی پەیوەست بوونی مامۆستاکانیان بەپارتی کرێکارانی کوردستانەوە وە ژمارەی کوژراوەکانی گەیشتۆتە (٣٠) هەزار کەس زیاتر لە (٢٦٠٠) گوند ڕوخێنراوە بەپێی بۆچونی وەزیری پێشووی دەوڵەت (علی شوقی) خەرجیەکانی جەنگی کوردستانی تورکیا ساڵانە (٨,٢) ملیار دۆلارە کە ئەکاتە (١/٥)ی بودجەی گشتی دەوڵەت، وە هێزە سەربازییەکانی تورکیا ئەوانەی بەشدارن لەم جەنگەدا زیاتر زیاد کراوە بۆ (٣٠٠) هەزار سەربازی تر. جگە لەپاسەوانی دێهاتەکان کە کوردەکان پێیان دەڵێن (جاش) حکومەت چەکداری کردون و ژمارەشیان دەگاتە (٦٠)هەزار کەس.

بۆ بەردەوام بوونی گەشتەکەم بەرەو شارۆچکەی (نەسیبین) کەوتمە ڕێ، کە کەوتبووە سەر سنووری تورکیاو سوریا، شارۆچکەکە (١٠٠) هەزار کەسی تێدا دەژیا، (٧٥٪) یان کورد بوون و(١٥٪)یان عەرەب و (١٠٪) یان تورك بوون، خێزانە کوردیەکان هەواداری پارتی کرێکارانی کوردستان بوون، زۆربەی دێهاتەکانی ئەم شارۆچکەیەش وێران کرابوون، لێرەشەوە بەرەو شاری (جزیرە) کەوتمە ڕێ، وە لەسەر ڕێگای (جزیرە- ئەدیلە) بینیم ناوچەکە ببووە جێگای

مۆلگا سەربازییەكان، دێهاتەكانیش وێران كرابوون من ویستم بەرەو مەركەزی (قایمقام) بەرێكەوم وە چاوم پێنەكەووت لەبەر ئەوەی یادیدامەزراندنی (٧٥) ساڵەی دەوڵەتی توركیا بوو. یەكێك لە پاسەوانەكانی قائیمقام لەگەڵمدا هات تاكو ماڵەكەیم پیشاندا، وە ڕازی نەبوو گفت وگۆی لەگەڵدا بكەم تاكو مۆڵەت لەلایەنە بەرپرسەكانەوە وەرنەگرێت لەكاتێكدا بەڕێگادا دەڕۆیشتن كاتێكم زانی دوو ئۆتۆمبیلی پۆلیس لەبەردەماندا وەستاون ئەفسەرێك و چوار پۆلیس هاتنە خوارەوەو جانتاكەمیان لێوەرگرتم و خستیانمە ناو ئۆتۆمبیلەكەی خۆیانەوە بەرەو بنكەی پۆلیس كەوتینە ڕێ، دەستیان كرد بە پشكنینم و جانتاكەمیان هەڵرشت و پێم ووتن كەمن گەشتیارێكم وویستوومە بەرو ماڵی قائیمقام بكەومەڕێ- پێیان ڕاگەیاندم دەبێ لە ئەنقەرە مۆڵەت وەرگریت بۆ ئەم سەردانە، دوای لێكۆڵینەوە لەگەڵمدا چەند پرسیارێكیان ئاراستە كردم هۆی سەردانەكەت چیە؟ ئایا پەیوەندیت هەیە بە كوردەكانەوە؟ لەكاتی پشكنینی جزدانەكەمدا چەند ژمارە تەلەفۆنێكیان بینی وەك ژمارە تەلەفۆنی سەرۆك كۆمارو سەرۆك وەزیران و چەند وەزیرێكی تر. ئەفسەرەكە لێیپرسیم ئایا وەزیری بەرگری دەناسیت؟ ووتم بەڵێ پێش سێ ڕۆژ لای بوم، دوای ئەوە بەڕێوەبەری پۆلیسخانەكەش هاتە بەردەمم و تەلەفۆنەكەی هەڵگرت و بەزمانی توركی دەستی كرد بە قسەكردن لەبارەی منەوە، جا نازانم قسەی لەگەڵ كێدا كردو باسەكان چیبوون؟ پاش دوو سەعات لەدەست بەسەركردنم ئەفسەرێك هات بۆ لام و ووتی (جیزرە) ناوچەیەكە حاڵەتی نائاسایی تیایەو قەدەغەیە بێگانە ڕووی تێبكات، بە ئۆتۆمبیلێك بەرەو نووسینگەیەكی سەفەریان بردم وداوایان لێكردم بلیتی ڕۆیشتن ببرم بەرەو ئەنقەرە كە (١٨) كات ژمێر لەم شوێنەوە دوور بوو، ئەم سزایە بۆ تەمێ كردنم بوو... بەرەو ئەنقەرە بەڕێكەوتم. وە لەئەنقەرە ڕستەكەی یەشار كەمالم بیركەوتەوە، منیش ووتم ڕاستە ئەنقەرە دەریاكانی ووشك كرد بەلام ماسیەكانی هێشتا زیندوون هەستم كرد من لەبەندیخانەیەك

بووم ناوی كوردستان بوو... ئای لەو دۆزەخەی بۆ كورد ئامادەكراوەو بۆچی ویژدانی جیهان ئیبادەی كوردییان بیرچۆتەوە؟

- كۆتایی -

**********

# داهاتووی ئیسلامی سیاسی و دەست تێوەردانی سوپا لەسیاسەتی توركی

ڕەفای ئیسلامی نەبووە هۆی داگیركردن و پاوان كردنی ئیسلامی سیاسی توركی، بەڵكو ئیسلامی سیاسی توركی دیاردەی زیندووبونەوەو گیان بەبەرداهاتنەوەی ئیسلامەتی‌یە لە توركیا.

مەبەست لەو دیاردەی (زیندوبونەوە - الاحیاء )ی ئیسلامی، زیندووبوونەوەی ئیسلامە وەك سیستەمێكی تەواو لە پەیوەندییەكانی مرۆڤ بە گەردوونەوە بەهەڵسووكەوت و بەهاكانی ژیانەوە، سیماكانی زیندووبوونەوە لەچەند شێوازێكدا دەردەكەوێت شێوازی (مەراسیمە ئایینیەكان، خواپەرستی، ڕووخسارو، سەرپۆش كردن، پەچە گرتنەوە، ڕیش هێشتنەوە) وە بانگەواز بۆ جێبەجێكردنی شەریعەتەكانی ئیسلام پاش ئەمە ڕۆیشتن و پەنابردن بۆ توندوتیژی بەمەبەستی گۆڕینی ناحەزانی ئیسلام و ڕامالینی دەسەلاتداران- كافرەكان، ئیتر لەم خاڵەی دوواییەوە جۆرێكە لەدەرچوون لە ئیسلام و خراپ لێ تێگەیشتنی، لەم مەفهومەی سەرەوە دەردەكەوێ دیاردەی زیندووبوونەوەی ئیسلامی لە توركیا وەك باقی حیزبەكانی تر لە قالبێكی حیزبی سیاسی‌دا خۆی پێكەوەنا، سیستەمی نیشتمانی - سەلامەتی نیشتمانی - ڕەفا .

كاتێك ڕێبازە ئایینیەكان لەساڵی ١٩٢٥دا نیشانەی پرسیاریان خرایە سەرو ڕێیان گرت لەجم و جۆڵەكانیان و ناچار بوون شێوە خەباتی خۆیان بگۆڕن بۆ خەباتی

ژێر زەمینیو پاشان بوونە چەند شانەیەكی نهێنی توندو تۆڵ لە كاتەكانی حوكمی ئەتاتورك و ئینۆنۆدا، پاشان بواری باشتریان بۆ ڕەخساو سیاسەتی توركیا بووە سیاسەتێكی فرەحیزبی لەساڵی ١٩٥٠دا، ڕێبازە ئایینیەكانیش زەمینەیەكی فراوانتریان بۆ دروست بوو وێرای دروست بوون و بەرقەراربوونی نیمچە دیموكراتیەك لە توركیا بەڵام ئەمان ئەم كۆت و بەندەیان بەتەواوی لەسەر لا نەچوو بوو ڕێبازە ئایینیەكان بیریان لەشتێكی تر كردەوە شانە نهێنیەكانیان بگۆڕن بەچەند دامەزراوێكی خێرخوازو ڕێكخراوو كۆمەڵەی زانستیو ڕۆشنبیریی، بەهۆی ئەم گۆڕانكاری‌یەوە ڕێبازی نەقشبەندی لە حەفتاكان و هەشتاكاندا خۆیان بەخەڵك ناساندو ڕۆڵێكی بەرچاویان هەبوو لەبوارەكانی سیاسیو كۆمەڵایەتیدا، لەمەشەوە بەرەو قۆناغێكی تر ڕۆیشتن و شێوەی حیزب وەرگرتن بوو. لەساڵەكانی حەفتادا یەكەم حیزبی سیاسی ئیسلامی دامەزرا بەسەرۆكایەتی ئەربەكان لەژێر ناوی (النظام الوطني) ئەم حیزبە لەهەناوی ڕێبازی نەقشبەندی‌یەوە هاتە دەرێو بەدەست پێشكەرێو كۆمەك كردنی ماددیو مەعنەوی (محمد زاهیر كوكتۆ) كە سەرۆكی ڕێبازی نەقشبەندیەكان بوو، هەروەها كەسایەتیەكی تر كەناوی (كوركوت ئوزال) بوو وە لەباسەكانی پێشوودا ناوی هاتبوو ئەمیش ئەندامی ڕێبازی نەقشبەندیەكان بوو لەسەردەمی حوكم كردنی براكەی (توركوت ئوزال) دا ڕۆڵێكی كاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر حیزبەكەیو حكومەت.

شان بەشانی ئەم ڕێبازە، ڕێبازی (نەورەسیەكان) هەبوو (فتح الله جولین) دەیبردن بەڕێوە، ڕۆڵێكی كاریگەریان هەبوو لەناو توركیا، ساڵی ١٩٧٨ گۆڤارێكیان دەركرد بەناوی (سیزینتی) پاشان گۆڕا بۆ ناوی گۆڤاری (زمان) چەند گۆڤارێكی تریشیان هەبوو وەك گۆڤاری (سور)و (زەفەر)، بەدەیەها خویندنگاو زانكۆیان دروست كرد، خاوەنی (٢٠) ئێستگەی رادیۆو كەناڵی تەلەفزیۆن بوون خاوەنی دامەزراوێكی مالیی گەورە بوون بەناوی (ئاسیا فاینانس) و خاوەنی چەند بانكێك بوون.

پێوانەکانی زیندووبوونەوەی ئیسلامی تورکیا بەم شێوەیە بوو:—
خولەکانی فێرکردنی قورئـانی پـیرۆز ژمارەیـان (٢٦١٠) خـوول بـوو. وە لەسالّی ١٩٧٩ تـاکو سـالّی ١٩٩٠ گەیشـتە (٥١٩٧) خـوول، وە ژمـارەی قوتابیـەکانی گەیشتە (٣٠٠) هەزار قوتابی، وە ژمارەی قوتابیەکانی (امام – خطیـب) لەسالّی ١٩٧٥ بریتـی بـوو لـە (٦٦) هـەزار قوتـابی وە سالّی ١٩٩٦ ژمـارەی قوتابیـانی زیادی کرد بۆ (٤٠٠) هەزار قوتابی، سالّی ١٩٨٠ ژمارەی مزگەوتەکانی تورکیا ٥٧ هەزار مزگەوت بوو، وە تاسالّی ١٩٩٥ ژمارەی مزگەوتـەکان بـوون بـە (٧٠)هـەزار مزگەوت واتە هەر مزگەوتێك بۆ (٨٢٥)کەس ، وە ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامانـەی سـەر بەڕەوتە ئیسلامیەکان بوون بریتی بوون لە (٥٠٠) گۆڤارو ڕۆژنامە جگە لـە (٣٥٠) ئێستگەی ڕادیۆو (٤) کەنالّی تەلەفزیۆن.
وە لەبوارەکانی ئابووریشدا بەپێی سەرچاوە سەربازییەکانی تورکیا کە ئاماژەی بۆ دەکـەن ژمـارەی بازرگانـە جـۆراو جـۆرە ئیسـلامیەکان (٣٠٠٠) کـەس زیـاترن خـاوەنی (١٠) هـەزار کۆمپانیـای جۆراوجـۆرن، (٥٠٠) هـەزار کرێکـارو فەرمانبـەر کاریـان تیادەکـەن، سـەرمایەی ئـەم کۆمپانیانـەش زیـاتر لـە (٢٠) ملیـار دۆلارە، ناردنە دەرەوەی کالاّکانیان، سالاّنە (٨) ملیار دۆلارە، ئەم کۆمپانیانـە لەهـەموو بوارەکانی ژیانی تورکیـادا هەلّدەسوڕێن هـەموو لایەنـەکانی ژیانیـان گرتۆتـەوە.
کۆمپانیاکان کراون بەچەند بەشـێکەوەو چـەند کۆمپانیایـەك لـەژێر سەرپەرشـتی (کۆمەلّەیەکدا - مجموعة )یە وە بەناوبانگترین کۆمەلّەش:—
*کۆمەلّەی ئیخلاص: گەورەترین کۆمەلّەی ئیسـلامیەو (٥٠٥) کۆمپانیـا دەگرێتـە خـۆ لـەبوارەکانی بەلّێندەرایـەتیو گەشـت و گـوزارو بانکـەکان وئۆتۆمبیـل و ئیستگەو تەلەفزیۆن و بلاّوکردنەوەدا هەلّدەسوڕێن.
*کۆمەلّەی کۆمباسان: لە (٢٦) کارگە پێك هاتووە (٣٦) هەزار کرێکار کاری تیـا دەکـات لـەبوارەکانی دروست کردنـی کاغـەزو پێسـتەو چـەرم و کەرەسـتەی بیناسازیو گواستنەوەو بازرگانیەکانی دەرەوە کار دەکەن.

*كۆمەڵەی یەمباش: چەند بازرگانێكی گەورەن ژمارەیان (٤٢) بازرگانە لەناو وولاتی ئەڵمانیا هەڵدەسورێن.
*كۆمەڵەی ئۆلكەر: تایبەتن بەبەرهەم هێنانی خۆراك، داهاتی گشتی ساڵێكیان تەنها لە (١٩٩٦)دا بریتی بوو لە (٦٥٠)ملیۆن دۆلار، بەرهەمەكانیان بە (٧٠) دەوڵەتی جیهان دەفرۆشنەوەو ساڵی (٢٠٠) ملیۆن دۆلاری لێدەفرۆشن.
جگە لەم ڕێبازەو بزووتنەوە ئایینیانە باسكران، وە هەر لەچوارچێوەی دیاردەی زیندووبوونەوی ئیسلامیدا، بزووتنەوەی ئوسولیش هەن و پەنا بۆ هێزو زەبرو زەنگ دەبەن وەك (بەرەی گەورەی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی، حیزب الله، كۆمەڵەی مەنزیل، سوپای ڕزگاری ئیسلامی، كۆمەڵەی ڕزگاری توركیای ئیسلامی، ڕێكخراوی جولاندنەوەی ئیسلامی، حیزبی ئیسلامی توركی)... چەند گروپێكی تریش.
(تۆڵەی خودا - ثأر الله) ناونیشانی پەرتوكێكە لەلایەن لێكۆڵەرەوەی فەرەنسی (جیل كیبیل) وە نوسراوەو باس لە بزووتنەوە ئوسوڵیەكانی ناو ئاین دەكات. نووسیووێتی كە ئوسولیەت تەنها لە ئایینی ئیسلامدا نیە، لەهەموو ئایینەكانی تردا دەبینرێت، ئوسوڵیەت دیاردەیەكە نمونەی كاردانەوەیەكی توندە لەدژی هێزی تازەگەرێتی، ئوسولیەت دەبێتە حاڵەتی نامۆبوون بۆ بەشێك لەدانیشتوان، ئەم حاڵەتە تاڕادەیەك لە كۆمەڵگا دەمێنێتەوەو پاشان دەرەوێتەوە بەهۆی هاتنە پێشەوەی تازەگەری لەخودی خۆی داو كۆنترۆڵ كردنی بەسەر حاڵەتەكانی تردا، ئەوەی ئێمە دەمانەوێت بیڵێین لەڕوانگەی ئەم لێكدانەوەیەی سەرەوە ئەوەیە كە ئیسلامی ئوسولی خاوەنی هیچ ئایندەیەك نیە، نابێتە خاوەنی زەمینەیەكی كۆمەلایەتی بەرفراوان و نابێتە خاوەنی بەرنامەیەكی گەش، یاخوود بەرنامەیەك كە ببێتە هۆی ئەڵتەرناتیڤێكی باوەڕپێكراو شان بەشانی تازەگەری بڕوات.
زانای سیاسی ئەمەریكی (صمویل هانتكتون) نموونەیەكی هێناوەتەوەو دەڵێ:-
هەردوو زیندووبوونەوەی ڕۆشنبیریو ئایینی وەلامدانەوە (كاردانەوە)ی پرۆسەی

تازەگەرین گەر لە پرۆسەی تازەگەری زیاتر ووردبینەوە دوو لایەنمان بۆ دەردەکەوێت لەسەرێکەوە دەبێتە هۆی پتەو بوونی هێزی ئابووریو سەربازی و سیاسی کۆمەڵگاو لەلایەکی ترەوە دەبێتە هۆی مایەی دواکەوتن لەسەر ئاستی تاکەکان هێنایە کایەی نامۆ بوون و قەیرانی ناسنامە، وە بەرهەمەکانی تازەگەریش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر ئاستی تاکەکان و لەسەر ئاستی کۆمەڵگا ئەم کاریگەریەش دەبێتە خولقاندنی باری رۆشنبیریو ئایینی.

لەتورکیا هەروەك (هانتکتون) دەڵێت: کاتی خۆی ئەتاتورکیەت پێشنیارێکی (تازەگەری)ی کۆمەڵگایەکی نائەوروپی بوو، لەپێناو سەرخستنی ئەم تازەگەریەشدا توندرەوانە پەنای دەبردە بەر (نامۆ) بوون، و پاشان زیندوو بوونەوەو هەستانەوەی ئیسلامی لە تورکیا وەلام دەرەوەیەك بوو بۆ نامۆبوونی کۆمەڵگەی تورکی نائەوروپی.

راستە گەر بلێین پرۆسەی تازەگەریو نامۆ بوونی تورکیا بۆتە هۆی بەهێز بوونی کۆمەڵگای تورکی لەباری ئابووریو سیاسیو سەربازیدا (گەر لەچاو کۆمەڵگا ئیسلامیەکاندا بەراوردی کەین) دیاردەی هەستانەوەو زیندوبوونەوەی ئیسلامی

كۆمەڵگای توركی بەسەر چەند هێڵێكدا دابەش بووە...! هێڵی سیستەمی بەهاكان و ناسنامەو ڕێگاكانی ژیان. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەزموونی (تازەگەری - نامۆبوون) كە هێشتاو تا ئێستاش ئەزمونێكی ساناو بیروكراتیی‌یە تەنها ڕوكارەكەی دەبینرێت. بەهەمان شێوە زاراوەی عیلمانیەتیش لە توركیا خۆی فەرزكرد، بەشێوەیەكی ساناو بیرۆكراتیانە هاتە پێشەوە بەبێ پشت بەستن ولەبەر چاوگرتن و هەڵسەنگاندنی فاكتەرە كۆمەلایەتی‌و فەلسەفی‌و ئاكاری– اخلاقی‌و فاكتەرە سیاسی‌یەكان، ئەمەی لە توركیا بوو پێچەوانەی ئەو كردارە بوو كەلە ڕۆژئاوا ڕوویدا. كاتێك عیلمانیەت لە ئەوروپا سەری هەڵدا پاش مشت و مڕو جەدەلێكی فیكری‌و سیاسی‌و كۆمەلایەتیەكی زۆر كەچەند سەدەیەكی خایاند ئینجا توانی جێگای خۆی بكاتەوەو خۆی بچەسپێنێت و لە پێش بزووتنەوە فەلسەفی‌و كۆمەلایەتی‌و سیاسیەكانی تر خۆی بنیات نا، عیلمانیەت لە ئەوروپا لە قایل نەبوون و بەرپەرچدانەوەی دەسەلاتی كەنیسەوە هاتەدەری‌و سەرچاوەی گرت، لە پێناو دەستە بەركردنی ئازادی‌و سەربەستی تاكەكانی كۆمەڵ دا خۆی سەقام گیركردو خۆی دەرخست و پاشان پیرۆزبایی لێكرا. گرفتەكە لێرەدا، گرفتی ئیسلام نیە، بەڵكو گرفتی كۆمەڵگای عوسمانی‌یە پاشان بوو بە گرفتی توركی، هەروەك ڕۆژهەلاتناسان (هانتكتون و برنادلویس و دانیل بایبس) باسیان لێوە كردووە هەندێك كەس دەڵێن ئیسلام ناگونجێت لەگەڵ تازەگەریداو یان دەڵێن ئیسلام دووبەرەكایەتی هەیە لەگەڵ تازەگەریدا، ئەمانەی وا بۆ ئەم مەسەلانە دەچن ڕێك لە پێكەوە گرێدانێكی مەوزوعیانەدا لەگەڵ ئیسلامیە ئوسولیەكان یەكدەگرنەوەو یاخود دەڵێن ئاین لەگەڵ سیاسەتدا ناگونجێت و بەیەكەوە هەڵناكەن نكۆڵی لەو پەیوەست بوونە دەكەن نكۆڵی لەو پەیوەستبوونەی ڕۆژئاواش دەكەن و ئەم حاڵەتە نابینن، لەئاینی ئیسلامدا پەیوەست بوونی (ئاین -سیاسەت) جێگای بۆتەوە، هەموو بەڵگەكان ئەوە دەردەخەن ئاین تەوەرێكی ژیانی سیاسی گشت كۆمەڵگایەكە، شانشینی ئینگلتەرا خۆی سەرۆكی یەكێك لە كەنیسەكانە، یا كەنیسەكانی ئەڵمانیا هەندێك

باجیان -(ضريبة) دەست دەكەوێت لە خەڵكانێك كەمەسیحی نین، هەروەها لە كۆشكی سپی ئەمەریكا تا ئێستا لەچەژنی ئاینیی سەری ساڵدا (درەختی لەدایك بوون) دادەگیرسێنن و ۹۰٪ی ئەمەریكاییەكان بڕوایان بە ئایینی خۆیان هەیە، كەواتە ئاینی ئیسلامیش ئایینەو سیاسەتیشە هەڵەیە گەربڵێین سیاسەتێكی ئاینی، ئەوانەی سیاسەت دەكەن یاسیاسیەكان خۆیان بوونەوەرێكی ئاینین.

وەك ووتمان گرفتەكە گرفتی كۆمەڵگای توركی بوو؛ گرفتی نەبوونی هێزە كۆمەڵایەتیەكان بوو (بورجوازی - لەفەرهەنگی ئەوروپیدا)، بووە هۆی هاتنە پێشەوەی خەلیفەو سوڵتانەكان مانای ئەوەی بەرهەمی تازەگەری و عیلمانیەتی هێنایە ئاراوە خەلیفەكان وسوڵتانەكان بوون لەكاتی خۆرێكخستنەوەی توركیاو كردنی بەدەوڵەت، وە سوپا یەكەم مەیدان بوو بۆ تازەگەری لەبوارەكانی (رێكخستن و بەڕێوەبردن و تەكنیەكەكان) لێرەوە دەستی پێكردو ئامڕازەكانی تازەگەری دەوڵەت و كۆمەڵگا بوو...

پێش پەیدا بوونی تازەگەری، شێوەكانی سەربازی بەپێی دەستووری ساڵی ۱۸۷٦ دەچوون بەڕێوە.وەكاتێك سوڵتان عبدالحمید بوژایەوەو بەرپیی خۆی بینی، هەستا بەلابردنی دەستووری ساڵی ۱۸۷٦و شێوەی سەربازی پێش خۆی كەلەرێكخراوی نهێنی پێك هاتبوون و سوڵتان عبدالحمید ناچاربوو بگەرێتەوە سەر دەستووری ساڵی ۱۹۰۸ وە یەكەم كۆدەتای سەربازی لێرەوەرویدا لە مێژووی توركیادا، كۆماری توركی دامەزراو ئیتر ئەوانەی بەرگی سەربازیان لەبەر دەكرد تەرخان كران بۆ رزگاركردنی نیشتمانەكەیان، توركیای نوێ لەژێر سەركردایەتی غازی مصطفى كمال ئەتاتورك دامەزرا ئیتر لەو كاتەوە سوپا بوو بە پارێزەری كۆماریو عیلمانیەت. ئیتر رۆڵی سوپاو ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بەتەواوەتی چەسپێنرا لەدوای كۆدەتای ساڵی ۱۹۷۱ لەدەستووری ساڵی ۱۹۷۱و كۆدەتای ساڵی ۱۹۸۰ لەدەستووری ساڵی ۱۹۸۲ مادەی (۱۱۸).

سوپا مادەی (۳٥)ی بەكار دەهێنا تایبەت بوو بە سیستەمی كاروباری ناوخۆی هێزە چەكدارەكان كردیە بنەمایەكی یاسایی بۆ هەستان بەكودەتای سەربازی

لەکاتێکدا هەست بکات کۆماری دیموکراتی کەوتۆتە ژێر مەترسیەوە. ئەوەی گرنگە لێرەدا سوپای تورکی تەماشایەکی خۆی بکات بۆی ڕوون دەبێتەوە کە سوپا (سوپای دەوڵەتە) نەك (سوپای سیستەم)ەكە. ئەو دەستوورەی یەکەمجار نوسرایەوە بۆ سوپا دوو وێنەی جیاوازی پێدا، لەلایەکەوە سوپا بووە کەلەپورێکی دەوڵەتی عوسمانی لەلایەکی ترەوە گەشەکردنێکی نوێی پێبەخشی وەك سوپای نیزامی، یاخود کاتێك سوپا دەبێتە ئامرازێك لە پێناو چاککردنی هەرەمی کۆمەڵگاداو دەبێتە کیانێکی سەربەخۆ لە کۆمەڵگا بەلام بەمەرجێك ئەو چاك کردن و ئەو گۆڕانە کۆمەلایەتیە نابێت هەڕەشە لەدەوڵەت بکات.

تا ئێستا دیموکراتیەت لە تورکیا هیچ مانایەکی نیەو تەنها ئامرازێکە بۆ بەهێزترکردنی دەوڵەت، دیموکراتیەت گوزارشت لەڕای گشتی دەکات بۆ دۆزینەوەی ڕێگا چارەکان و کێشە سیاسیو ئابووریو کۆمەلایەتیەکان کەچی زۆربەی ئەفسەرەکانی ناو سوپا بڕوا بەمە ناهێنن دەڵێن نابێت دیموکراتیەت ببێتە ئامرازێك بۆ یەکبوونەوەو یەکخستنەوەی بەرژەوەندیە کۆمەلاتیەکان پێیان وایەو لەو باوەڕەدان کێشەمە کێش و ناکۆکی بەرژەوەندییە کۆمەلایەتیەکان هەڕەشە لەدەوڵەتی کۆماری دەکەن پێویستە لەژیانی سیاسیدا دەستێوەردانی سەربازی هەبێت.

تێڕوانینی ئەفسەرە تورکیەکان بەرامبەر حیزبە سیاسیەکان تێڕوانینێکی تەسك بینانەیە دەڵێن حیزبەکان گردبوونەوەی چەند کەسێکەو تێکۆشانەکەشیان لەپێناو بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆیانەو بەرژەوەندی دەستەگەرییە ئەمە لەلایەك و لەلاکەی ترەوە ئەمانە ئەبنە هۆی بەش بەشکردنی نەتەوە بەسەر چەند کۆمەڵێکداو دەبنە مایەی هەڵگیرساندنی ئاگری چینایەتیو نەتەوەییو ئایینی، ئەم حیزبانە دەبێت تێبکۆشن بۆ دڵنیا کردنەوەی ئەتاتورکیو یەکێتی خاکی وولات بپارێزن بڕوابەم سەربەخۆییەی ئێستا بهێنن لەمەشەوە دەردەکەوێت ئەفسەری تورکی تەنها سەربازێکەو ڕۆڵێکی وەزیفی هەیە.

ئەفسەری تورکی خۆی بەپارێزەری دەوڵەت نیشان ئەدات و لەسەرێتی بیروباوەڕەکانی ئەتاتورك بپارێزێ، پێیوایە بیروباوەڕەکانی ئەتاتورك گوزارشت لە بەهاکان و سەرخستنی دیموکراتی دەکات..

بەپێی تێپەڕبوونی ڕۆژگارەکان دەرکەوتووە جگە لە پاراستنی وولات، ئەرکی تریشی گرتۆتە ئەستۆی خۆی ئەرکی پاراستنی عیلمانیەت و یەکێتی خاکی وڵات، سیستەمی دیموکراتی وەك لەدوای هەردوو کۆدەتای ساڵەکانی ١٩٦٠، ١٩٧١ جارێکی تر سوپا هاتە ناوەوە بەمەبەستی دامەزراندنەوەی سیستەمی ئابووریو کۆمەڵایەتی و لایەنی سیاسی لەلایەکەوە، بەرەو پێش چوونی ئیسلامی سیاسی گرتنە دەستی حوکم لەلایەن ڕەفاوە لەلایەکی ترەوە، کێشە لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەت هاتەکایەوە، بیانووی سوپاش بۆ دەستێوەردان هەمیشە بریتی بووە لە مەترسیەکانی دەوڵەتی کۆماری و عیلمانی.. وە ڕاستە گەر بڵێین ئەربەکانیش وویستوویەتی دزە بکاتە ناو کۆمەڵگاو لایەنە ئابووریەکان[3] و تێکۆشاوە بۆ نەمانی سیستەمی عیلمانیو بنیاتنانی سیستەمی ئیسلامی، ئەمەش لەتوانایدا نەبوو نەی ئەتوانی بیانخاتە خانەی واقیعەوە چونکە پارسەنگی هێزەکان بەلای خۆیدا نەشکابۆوەو لەبەرژەوەندی ئەو نەبوو بەهۆی ڕۆڵی سوپاوە ڕێژەی (٢٠٪)ی دەنگەکان حوکمی دەرکرد، وە نوخبەی عیلمانی لەناو حکومەت و حیزب و پەرلەماندا زۆرینەی دەنگەکانیان پێك هێنا بوو. هەوڵدانی ئەربەکان بۆ کورسی حوکم سوپای وریاکردەوەو بەوەی لایەنێك هەیە بەشی خۆیان دەوێت لەدەوڵەت و لەناو سوپاو نزیکەی (٧٥) ساڵە سوپا بەشی

---

(٣) ساڵی ١٩٩٧، ١٩٩٨ سوپا هەستا بەهەڵمەتێکی پاکسازی دژی ئەو پلەدارە سەربازییانەی مەیلی ئیسلامیان هەبوو لەتەمووزی ساڵی ١٩٧٧دا (٧٦) ئەفسەریان لەریزەکاندا دەرکرد وە لەمانگی مارتی ١٩٩٨ دیسانەوە (١٦٢) ئەفسەری تریان دەرکرد، مانگی تەمەمووزی ١٩٨٨ بەپێی بڕیارێکی ئەنجوومەنی باڵای سەربازی (٢٤) ئەفسەریان دەرکد.

کەسی لێنەداوە.یەکەم جار بوو لەمێژووی تورکیـای نـوێدا کەسانێکی هاوبەش هەبن لەدەسەلاتدا جیاوازیان هەبێت لەئایدۆلۆجیاو مەسەلە ستراتیجیەکاندا.
سوپا لـەماوەی کودەتاکـانی سـالّی (١٩٦٠،١٩٧١،١٩٨٠) وەئـەرکی دروسـت کردنەوەی هەرەمی سیاسی تورکیا لەژێر کۆنترۆلّی خۆیدا بووە، پاسـاودانەوەش بۆ کۆدەتاکـان وەك خۆیـان باسـیان لێوەدەکـرد لەبـەر چـارەکردنی قەیرانـە کۆمەلایـەتیو ئابوورییـەکان و ڕەوینـەوەی پاشـا گەردانییـەکان بـوو سـوپا سەرکەوتوو بوو لەهەلّتەکاندنی گروپە ئوسولّیەکانی وەك حیزبی فەضیلەو چـەند حیزبێکی تر وەك چۆن کاتی خۆی بووە هـۆی هەلّتـەکاندنی حـیزبی (سیستـەمی نیشتمانیو سەلامەتی نیشتمانیو ڕەفا).
ئەمـە مانـای وایە سـوپا دەسـەلاتێکی شـکۆمەندانەی بـەخۆیداوە و لەسـەرو سـەروەری دەسـتورو سەروو دەولّـەت و هەلّبژاردنەکانەوەیـە، لەگـەلّ ئەمەشـدا بوژاندنەوەی ئیسلامی هەرمایەوە بۆیان لەبار نـەبرا. وەزیـری بـەرگری پێشـووی جەزائیر جەنەرال (خالد نزار) ووتی: (حالّەتەکانی تورکیاو جەزائیر لەیەك دەچن) دەیوویست شەرعیەت بداتە سوپای جەزائیر بۆ دەستێوەردان ئـەوە بـوو کـاتێك بەرەی ڕزگاری جـەزائیر لەهەلّبژاردنـەکانی سـالّی ١٩٩٣ سـەرکەوتنی بەدەست هێنا کودەتایەکیان لەدژیان بەرپاکردو ڕێگەیان پێنەدان دەسەلات بگرنە دەسـت بەلام ئەم ڕایە پێچەوانەی وەزعی تورکیایە، تورکیا وەك جەزائیر نیەو جیاوازیـان هەیـە، لەجـەزائیر کوشـتار بەکۆمـەلّ و ڕەشـە کـوژی بەبـەردەوامی دەبیـنرێت تەقینەوەی بیناو شوێنەگشتیو تایبەتیـەکان هـەموو کـات و سـاتێکە، بـەلام لـە تورکیا بەم شێوەیە نیە هەرچەندە چـەند کـارێکی لـەم جۆرە دەکرێت لەلایـەن تورکـە ئیسـلامیە توندڕەوەکانـەوە لەشـارەکانی وەك ئەسـتەنبوول ئـەم جـۆرە کارانـە نـاو بـەناوەو نەبۆتـە کـارێکی ڕۆژانـە. سـالّی ١٩٨٦ کۆمـەلّێك ڕۆشـنبیر و توێـژەرەوەی تورکـی ڕاپرسـیەکیان بـەناو خـەلّك دا ئـەنجام داو لـەئاکامدا تەنـها (٧٪) ی خەلّکەکـە دروســت کردنــی دەولّـــەتی ئیســلامیان ڕەت کــردەوە. لەوڕاپرسیەی سـالّی ١٩٩٥ دا کـرا (١/٣)ی خـەلّك ئارەزویـان لـەوە بـوو تورکیـا

بەرەو سیاسەتەکانی ڕۆژئاوا هەنگاوبنێ وە لەڕاپرسی سێیەمدا سالی ١٩٩٦دا کرا (٤١٪)ی خەلك دەنگیان بەحیزبی ڕەفادا وە (٧١٪)ی ئەم خەلکانەش بڕوا ومتمانەیان بەسوپا هەبوو بەهێمای عیلمانیەتیان دائەنا لەم ڕاپرسیەدا ڕاستیەکمان بۆ ئاشکرا دەبێت ڕەگ داکوتانی میللەتی تورکی دەردەخات خەلکانێکی نەتەوەیین پاش جەنگی ڕزگارکردنی وولاتی تورکیا بڕوایان بە ڕزگاری نیشتمانی هێناوە، خۆیان گوزارشت لە (تورکیەت)ی خۆیان دەکەن پێش ئەوەی هەر شتێکی تر بن، بەلام جەزائیریەکان پێچەوانەی تورکەکانن جولاندنەوەو بزووتنەوەکەشیان جیاوازی هەیە وەك هاونیشتمانیەکی جەزائیر خۆیان لەقەلەم نادەن، بەپێی ووتەکانی خۆیان جولاندنەوەیجەزائیرییەکان جولاندنەوەی موسلمانەکانە لەدژی کافرە فەرەنسیەکان، واتە ناسنامەی موسلمانێتی پێش ناسنامەی جەزائیرییە... کەچی تورکەکان دوو بەرەکایەتی زیهنی لەم جۆرەیان نیە خۆیان وا پێشان ئەدەن وەك موسلمانێك ووەك هاونیشتمانیەك، لەبەر ئەم هۆکارانە ئیسلامە ئوسولیە توندڕەوەکان نەیانتاوانی ژینگەیەکی گونجاو بدۆزنەوە هیچ دوا ڕۆژێکی وایان لە تورکیا نەبوو لەبەر ئەم هۆیانە لەدوای دابەزینی ئەربەکان لە حوکم تورکیا نەچووە خانەی جەزائیرەوەو بەرامبەر ئەمە دیاردەی زیندووبوونەوەی ئیسلامی گەشەی کردەوە.

ڕۆیشتنە خێراو یەك لەدوای یەکانی وەزعە ئابووریو کۆمەلایەتیو مەدەنیەکانی تورکیا (گواستنەوە لەلادێکانەوە بۆ شار) لەبەرهەم و دەسکەوتەکانی (تازەگەری) بوون ئەو گۆڕانکاریەی لەبیستەکاندا ئەتاتورك پێشنیاری کردو بەجۆرێك لە تازەگەری دائەنا، لەزۆر ڕووەوە گۆڕانکاریو گواستنەوەی هێنایە ئاراوە بەتایبەتی ئەو دوو مەسەلەیەی پەیوەندیان بەئایین و وەزعی سەربازیەوە هەبوو، ئەم پرۆسانەی ئەتاتورك و بەردەوام بوونی، تا ئێستا بووە هۆی پتەو بوون و سەرهەلدانەوەی ئیسلامیەت لەزۆربەی ناوچەکانداو بەتایبەت دێهاتەکانی ئەنادۆل ، ئیسلامیەکان کاریان تێکراو وایان لێهات خۆیان بگونجێنن

لەگەڵ عیلمانیەت و دیموکراتیدا لە پێناو دروست کردنی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی نوێخوازدا نەك دەوڵەتێکی ئیسلامی ئوسوڵی.

*******************

## ﴿ شێوازی ڕێکخستنەکانی سوپای تورکی ﴾

## ﴿ هەرەمی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ﴾

ناوی حیزبە تورکیەکانی بەشدار بوو لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٥ :--

*نیشتمانی دایك (الوطن الام)
*ڕێگای ڕاست (الطريق الصحيح)
*ڕەفا (الرفاه)
*پارتی بزووتنەوەی میللی (حزب الحركة الملية الوطنية)
*چەپی دیموکراتی (اليسار الديمقراطي)
*پارتی بەعس (البعث)
*پارتی ژیاندنەوە (الاحياء)
*گەلی کۆماری (حزب الشعب الجمهوري)
*پارتی ئیکتیدار (الاقتدار)
*پارتی نەتەوە (حزب الامة)
*پارتی دیموکراتی (الحزب الديمقراطي)
*پارتی کاری سۆشیالیستی (حزب العمل الاشتراكي التركى)
*پارتی یەکێتیی مەزن (حزب الوحدة الكبرى)
*پارتی نوێ (الحزب الجديد)
*پارتی ڕێگای دایك (حزب الطريق الام)
*پارتی گەلی دیموکراتی (حزب الشعب الديمقراطي)
*پارتی ڕاپەڕین (حزب النهضة)
*پارتی سۆشیالیستی یەکگرتوو (الحزب الاشتراكى المتحد)
*پارتی لیبرالی دیموکراتی (الحزب الليبرالى الديمقراطي)
*بزووتنەوەی دیموکراتی نوێ (حركة الديمقراطية الجديدة)
*پارتی دیموکراتی و گۆڕین (حزب الديمقراطية والتغير)
*پارتی دادوەری گەورە (حزب العدالة الكبرى)
*پارتی دادوەری تورکی (حزب العدالة التركي)

*پارتی دادوەری (حزب العدالة)
*پارتی شۆڕشگێری (حزب العمل الثوری)

# ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکانی (٢٤ی ئەیلولی ساڵی ١٩٩٥)

| پارتەکان | ژمارەی دەنگەکان | رێژەی سەدی (٪) | |
|---|---|---|---|
| (RP) پارتی ڕەفا | ٦٠١٢٤٥٠ | ٢١,٣٨ | ١٥٨ |
| (ANAP) پارتی نیشتمانی دایك | ٥٥٢٧٢٨٨ | ١٩,٦٥ | ١٣٢ |
| (DYP) پارتی ڕێگای ڕاست | ٥٣٩٦٠٠٩ | ١٩,١٨ | ١٣٥ |
| (DSP) پارتی چەپی دیموکراتی | ٤١١٨٠٢٥ | ١٤,٦٤ | ٧٦ |
| (CHP) پارتی گەلی دیموکراتی | ٣٠١١٠٧٦ | ١٠,٧١ | ٤٩ |
| (MHP) پارتی بزووتنەوەی نیشتمانی | ٢٣٠١٣٤٣ | ٨,١٨ | — |
| (HADEP) پارتی دیموکراتی میللی | ١١٧١٦٢٣ | ٤,١٧ | — |
| (YDH) پارتی دیموکراتی نوێ | ١٣٣٨٨٩ | ٠,٤٨ | — |
| (MP) پارتی نەتەوە | ١٢٧٦٣٠ | ٠,٤٥ | — |
| (YDP) پارتی هەڵهاتنی نوێ | ٩٥٤٨٤ | ٠,٣٤ | — |
| (IP) پارتی کرێکاران | ٦١٤٢٨ | ٠,٢٢ | — |
| (YP) پارتی نوێ | ٣٦٨٥٣ | ٠,١٣ | — |
| بێ لایەنەکان | ١٣٣٨٩٥ | ٠,٤٨ | — |
| **کۆی دەنگەکان** | ٢٨١٢٦٩٩٣ | ١٠٠,٠٠ | ٥٥٠ |

# خشتەی بەراوردکردنی ئابووریو گەشەسەندنی مرۆیی نێوان تورکیاو میسر

| | میسر | تورکیا |
|---|---|---|
| ژمارەی دانیشتوان (بەملیۆن) | ٥٧,٨ | ٦١,١ |
| داهاتی تاکەکەس (ساڵانە بە دۆلار) | ٧٩٠ | ٢٧٨٠ |
| ماوەی تەمەنی مرۆڤ (بەساڵ) | ٦٣ | ٦٧ |
| ڕێژەی نەخوێندەوار (٪) | ٤٩ | ١٨ |
| ئەوانەی ئاوی خواردنیان دەست دەکەوێت لە (٪) | ٨٤ | ٩٢ |
| ڕێژەی دانیشتوانی شار (٪) | ٤٥ | ٧٠ |
| تێکڕایی بەرهەمەکانی ناوخۆ (ملیۆن - دۆلار) | ٤٧٧٣٤٩ | ١٦٤٧٨٩ |
| بەرهەمی ناوخۆ تەنها لە پیشەسازیدا لە (٪) | ٢١ | ٣١ |
| تێکڕایی کاڵا نیردراوەکان بۆ دەرەوە (ملیۆن - دۆلار) | ٣٤٣٥ | ٢١٦٠٠ |
| تێکڕای کاڵا نێردراوەکان و خزمەتگوزاری (ملیۆن - دۆلار) | ١١٢٣٧ | ٣٨٠٦٩ |
| تێکڕای قەرزەکانی دەرەوە (ملیۆن - دۆلار) | ٣٤١١٦ | ٧٣٥٩٢ |
| ڕێژەی قەرز بۆ تێکڕای کاڵانێردراوەکان و خزمەتگوزارییەکانیتر (٪) | ١٢,٤ | ١٢,٢ |

# پێرست

# هەندێك لەسەرچاوەكان

١-في أصول التأريخ العثماني د.احمد عبدالرحيم مصطفى، دار الشروق. القاهرة ١٩٩٣.
٢-الحركة الكمالية والعلمانية في تركيا. السيد حسنين عثمان الطنوبى- رسالة ماجستير جامعة الاسكندرية، ١٩٨٩.
٣-السلطان عبدالحميد والخلافة الاسلامية، أنور الجندي، القاهرة.
٤-تأريخ أوروبا في العصر الحديث هـ.أ. ل. فيشر دار المعراف. القاهرة.
٥-الاسلاميون و تركيا العلمانية. هدى درويش. دار الافاق العربية القاهرة ١٩٨٨.
٦-الذئب الاغبر مصطفى كمال. هـ.س. أرمسترونج، دار الهلال، القاهرة ١٩٥٢.
٧-تحديث التخلف، رضا هلال دارسينا للنشر القاهرة ١٩٩٣.
٨-تأريخ الدولة العثمانية، روبير مانتران (إشراف)، دار الفكر للدراسات والنشر القاهرة ١٩٩٣.
٩-الدين في تركيا الحديثة، شريف ماردن - الدار التونسية للنشر، ١٩٩٣.
١٠-العلمانية والدين، محمد أركون، دار الساقى، لندن ١٩٩٠.
ناوی هەندێك لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی سوودیان لێ وەرگیراوە:-
١- الاهرام (القاهره).
٢-الحياة (لندن).
٣-السفير (بيروت).
٤-السياسة الدولية (القاهرة).
٥-شؤون الشرق الاوسط (بيروت).

لەنەتەوەی تورك زیاتر هیچ نەتەوەیەكی تر بۆی نی یە داوای مافە نەتەوایەتیەكانی خۆی بكات.

(عیصمەت ئینۆنۆ)

ئەنقەرە لەوانەیە بتوانێت دەریاكان وشك بكات بەلام ناتوانێت ماسیەكانی ئاوی ڕاو بكات.

(یەشار كەمال)

ئەو دەستانە بشكێ كە دەست درێژی دەكەنە سەر سەرپۆش.

(دروشمێكی پارتی رەفا)

ژمارەی سپاردنی (٢٩٥) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە

﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی ژین ﴾

نرخی (١٥) دینارە